یەکەمین گۆڤاری کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی
لە کوردستاندا
42
لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا

# بڕیار



مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی
ساڵی چوارەم - تشرینی دووەمی - ٢٠١١

ئەوینێکی نوێ!!

بوو بە ملیۆنێر، بەڵام..

ده هەنگاو
بۆ بەدەستهێنانی
بەختەوەری!

فەنابوونی کەشتیەکان

تەنها بۆ سەرکردەکان

تەمەنی ڕاستەقینەی خۆت بدۆزەرەوە

٣٠ ڕێگە بۆ سەلامەتیی
منداڵان لەسەر ئینتەرنێت

ڕازی
سەرکەوتن



The first Magazine Specialized in Management and Human Development in Kurdistan

لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا

# بریار

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی

ساڵی چوارەم - ژمارە 42 - تشرینی دووەمی 2011



چاپ: کۆمپانیای پیرەمێرد

نرخ 2500 دینار




























**ناونیشانی گۆڤار**

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری جەمالی حاجی عەلی- نهۆمی سێیەم

نزیک پردی خەسرەو خاڵ

٣١٩٣٩٤٦ - ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢

هەولێر ٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠

E-mail: bryar@bryarmagazine.com

دابەشکردن: کۆمپانیای پەیک

٣٢٠٤٠٩٦ - ٠٧٧٠٨٦٤٩٢١٠

یەکەم دڵۆپ

سەرنووسەر




# ئەوەی دوێنێی خۆی لەبیر بچێت، ناتوانێت نەخشە بۆ سبەینێی دابنێت!

کاتێك ئێمە خوێندکار بووین لە قۆناغەکانی پێش زانکۆشداو لە ڕۆژانێکدا کە زۆر دژوار بوو، کاتێك باسی ساڵانی بیستەکانو شۆڕشەکانی دواتری کوردیان بۆ دەکردین، سەرمان بۆ دەلەقاندو بەڵکو سەرمان لە مێژووی کۆنی کوردیش دەخوراو دەستمان بۆ شەرەفنامەو مێژووی کوردو کوردستانو مێژووی میرنشینەکانیش دەبرد.

بەڵام ئێستا زۆرجاران کە باسی ساڵانی نەوەدەکان بۆ خوێندکارانی زانکۆ دەکەین، لە باتی سەربۆلەقاندن، سەربادەدەن، چونکە زۆربەیان لە دایکبووی کۆتایی هەشتاکانو سەرەتای نەوەدەکانن!

بە جۆرێك کە خەریکە داستانی ڕاپەڕین دەبێتە ئەفسانەو نەوەی دوای ڕاپەڕین ئاگایان لەو هەموو ناسۆریو نارەحەتیو چەرمەسەرییە نەماوە، کە تووشی میللەتەکەمان بووە، بەو ڕووداوە گەورەیە مێژوویەکی نوێ بۆ گەلەکەمان تۆمار کرا.

جا ئەگەر باسو بەسەرهاتی (٢٠) ساڵ لەمەوبەر جێگەی سەرسوڕمان بێت، دەبێت مێژووی چەند سەدەیەك لەمەوبەر چۆن بێت؟!

بێ ئاگایی لە مێژوو، زەنگێکی ترسناکە، پچڕانی پەیوەندییە لەگەڵ دوێنێی پڕ سەروەریو خەبات، کە ئەمڕۆی لێوە لە دایکبووە!

گرنگیدان بە مێژووی نەتەوەو وردو درشتی ئەو ڕووداوانەی کە داستانی ژینی پڕ لە چیاو نشێوو سەختو دژواری میللەتی کوردە، ئەرکی نەتەوەیی سەرشانی هەموو تاکێکی کۆمەڵگەی کوردەوارییە، بەتایبەت خوێندەوارانو ڕۆشنبیران.

بەداخەوە کەمتەرخەمییەکی زۆر دەبینرێت بەرامبەر بەم ئەرکە نیشتمانییە، ڕۆژ بە ڕۆژیش بۆشایی نێوان ئەمڕۆو دوێنێو هەستی نیشتمانپەروەریو کوردپەروەری لە ڕۆحی نەوەی نوێدا لاوازتر دەبێت!

نەوەی نوێ کە بەبەرچاوی خۆیەوە دەبینێت مێژوو کەلتورو کەلەپوری ئەدەبو ڕۆشنبیری نەتەوەکەی فەرامۆشکراوەو هیچ پلانێك لە ئارادا نییە بۆ پاراستنو گەشەپێدانو بەرزڕاگرتنی مێژوو کەلتورو کەلەپور، ناهەقی نییە ئەگەر حاشا لە ڕابردووی خۆی بکاتو هیچی لە بارەوە نەزانێت!

تا ئێستا لەسەر ئەرکی حکومەتو وەزارەتی ڕۆشنبیریو هیچ لایەنو پارتێك دیوانێکی شیعری کوردی، یان کتێبێکی مێژووی کورد، خزمەتێکی کوردانە نەکراوەو لە چاپێکی قەشەنگو شایستەدا خزمەت بە نەتەوەی کورد نەکراوە!

تا ئێستا ئەوانەی وەکو مۆم بۆ پاراستنی مێژوو کەلەپورو ئەدەبی کوردی سوتاون، وەکو پێویست لای نەوەکان بە ڕەمزێکی گەورە نەناسێنراونو ڕێزیان لێنەگیراوە.

لە پرۆگرامەکانی خوێندندا، لە ڕاگەیاندنو پەخشوبڵاوکردنەوەدا، لە فیستیڤاڵو کۆنفرانسو کۆڕوکۆبوونەوەدا هەقی خۆیان پێنەدراوە!

ئەمە لەسەر ئاستی ناوخۆ، ئەوە لەسەر ئاستی دەرەوە هەر باسی مەکە!

تەنها ئەوەندە بەس نییە، ئێمە باسی مەزلومییەتی گەلو نەتەوەی خۆمان بکەین، تا خەڵکی بەزەییان پێماندا بێتەوە!

دەبێت خۆمان بە نەتەوەکانی جیهان بناسێنین، کە ئێمە خاوەنی مێژوویەکی پرشنگدارین، خاوەنی کەلتورو کەلەپورو ژیاری خۆمانین.

سەدان زانای ناودارو بلیمەتمان هەبووەو ئێستاش خاوەنی کەسانی شارەزاو پسپۆڕو لێهاتووینو توانیومانە بەرامبەر بە زریانو وەیشومەی زەمانە وەکو داربەڕووەکانمان پتەوو وەکو چیا بەرزەکانمان سەرکەش بین.

ئێمە خاوەنی سەلاحەدینو میری ئەردەڵانو میری سۆرانو بادینانو شێخ مەحمودو قازیو ئیبنو خەلەکانو ئیبنولحاجیبو ئامێدیو ئیبنو سەلاحی شارەزووریو چەندین زانای بلیمەتین.

دەبا ئاوڕێك لە ڕابردوو بدەینەوەو پەندو ئەزموونی لێوەربگرین، بۆئەوەی بتوانین نەخشە بۆ سبەینێمان دابنێین!

# کارگێڕی بە گوفتار

ترس تەنها دڵە خراپەکان دەترسێنێت!

شکسپیر

ئەوەی خێرو چاکەی بۆ خەڵکی بوویت،
ئەوە خێرو چاکەی بۆ خۆی مسۆگەر کردووە!

کۆنفۆسیۆش

ئەوەی زۆر ببێتە هاودەمی دونیا،
چاوی ڕاستییەکان بە پێچەوانەوە دەبینێت!

موتەنەبی

گوێ بە نارەحەتییەکانی ڕۆژگار مەدە، لە کاتێکدا
هێشتا ڕۆح لە جەستەتدا ماوە.

موتەنەبی

پێم بڵێ ئەو پیاوە کێیە، کە ڕێزی دەگریت؟ پێت
دەڵێم تۆ چۆن پیاوێکی!

توماس کارلایل

پیاو هەموو کاتێك پیاو نییە،
بەڵام ئافرەت هەموو کاتێك ئافرەتە!

جان جاك رۆسو

پیاوی بەهێز کاردەکات و
پیاوی لاوازیش خۆزگە دەخوازێت!

بەرنادشۆ

# بوو بە ملیۆنێر، بەڵام..




پێش چەند ساڵێك كابرایەك لە نێو خزمو كەسو هاوڕێكانیدا، ڕایگەیاند كە ئامانجی ئەوەیە لە ساڵی داهاتوودا ببێت بە ملیۆنێر، ئەم پیاوە لەو كەسە داهێنەرانە بوو كە باوەڕی بەو پەندە بوو كە دەڵێت: (بیرۆكەیەكی باشم پێ بڵێ، منیش ملیۆنێك بەدەستدەهێنم)!

ئەم پیاوە كاریكرد لە پەرەپێدانو تۆماركردنی بەرهەمێكی وەرزشی كە پەیوەندی بە وەرزشی جەستەوە هەبوو، هەموو ناوچەكان بۆ فرۆشتنی دەگەڕا، هەندێجار بۆ ماوەی هەفتەیەك یەكێك لە منداڵەكانیشی لەگەڵ خۆیدا دەبرد.

خێزانەكەی سكاڵای ئەوەی لا دەربڕی كە بۆ گەشتەكان منداڵەكان لەگەڵ خۆیدا نەبات، چونكە كاتێك دەگەڕێنەوە تووشی كەمتەرخەمی دەبن، لە وانەكانیانداو ئەركەكانی قوتابخانەیان جێبەجێ ناكەن!!

لە كۆتایی ساڵدا، ڕایگەیاند كە ئامانجەكەی خۆی بە دەستهێناو ملیۆنە دۆلارەكەی كۆكردەوە!!

بەڵام پاش ئەو ڕاگەیاندنە بە ماوەیەكی كەم خێزانەكەی تەڵاق دا، دووان لە منداڵەكانیشی ئالوودەی ماددە هۆشبەرەكان بوون، سێیەمیان ڕۆیشتو نەگەڕایەوە، بە كورتی خێزانەكەی هەڵوەشاو بە تەواوەتی هیچی بەسەر هیچەوە نەما!

ئەم پیاوە هەموو هەوڵو تێكۆشانی خۆی بۆ گەیشتن بە یەك ئامانج خستبووە گەڕ، كە ئەویش بەدەستهێنانی ملیۆنێك دۆلار بوو، بەشێوەیەك هەموو شتێكی تەنها بەو ئامانجەی دەپێوا!

بەڵام نەیزانی كە باجی ئەو كارەی پاشماوەی هەموو ژیانی بە هەدەر دەبات!

پەیداكردنی ئەو ملیۆن دۆلارە زیانێكی وەهای لێداو گورزێكی وەهای لێوەشاند، كە زۆر لەو ملیۆنە گرانتر بێتو بە هەموو سەروەتو سامانی دونیا قەرەبوو نەكرێتەوە.

**لەم چیرۆكەوە فێر دەبین:**

١- بەرنامەدانان بۆ گەیشتن بە ئاستی ماددی بەرز، كارێكی خراپ نییە، بەڵام نابێت لەسەر حیسابی شتی تر بێتو لایەنە گرنگەكانی ژیان فەرامۆش بكرێت!

٢- زۆر كەس هەن لە كۆكردنەوەی سەروەتو ساماندا توانیویانە بگەنە ئاستێكی بەرز، بەڵام بەداخەوە ئەو شتانەی لەو ڕێگەیەدا لە دەستیان داوە، هەرگیز پارەو سامان جێگەیان ناگرێتەوە.

٣- هەندێك لەو دەوڵەمەندانە خێزانەكانیان لە بچووكترین ماف بێبەش كردووە، نەیانتوانیوە باوكێكی باش بن، منداڵەكانیان لە سۆزی باوكانە بێبەشن، لە پەروەردەو سەرپەرشتیكردنی باوكیان بێبەشن!

٤- زۆرێك دوای تەمەنێك ماندووبوونو نارەحەتیو كارو تەقەللای بێوچان، لە بری ئەوەی لە باوەشی خێزانێكدا پشوو بدەن، دوا ساتەكانی ژیانیان بە ئاسوودەیی بەسەربەرن، خۆیان لە خێزانێكدا دەبیننەوە كە شیرازەی تێكچووەو ئەندامەكانی پەرتەوازە بوونو وەكو كەسێكی بێكەس ماڵاوایی لە ژیان دەكات!

٥- دەوڵەمەندی ناتوانێت شیرازەی خێزانێك ڕێكبخاتەوە كە لێكترازاون، دووچاری جیابوونەوەو پەرتەوازەبوون بوون.

٦- ئەو كەسانەی كە تەنها تەركیزیان لەسەر كۆكردنەوەی سامانە، سەروەتو سامانەكەیان جگە لە بەڵاو ماڵوێرانی هیچ سوودێكی تری بۆیان نییە، نەخۆیانو نە دەوروبەریش هیچ سوودێك لەو سامانە وەرناگرن!

٧- پێویستە بزانین چۆن ئامانج دیاری دەكەینو چۆن بەرنامەی بۆ دادەنێینو نابێت هۆكارو وەسایلەكان بكەین بە ئامانجو ئاواتو لە پێناو پارەو ساماندا گەورەترین نیعمەتەكانی خودا فەرامۆش بكەینو خۆمان مەحروم بكەینو وابزانین بە پارە هەموو شتێك چارەسەر دەكرێت!



# تەنها بۆ سەرکردەکان

**ئەگەر ناتەوێت سەرکردەبیت، ئەم لاپەڕەیە مەخوێنەرەوە!**

سەرکردە ئەو کەسەیە کەوا لە خەڵکی دەکات متمانەیان پێبێت، بەڵام سەرکردەی ناوازە، ئەو کەسەیە کە وا لە کەسانی تر دەکات متمانەیان بە خۆیان هەبێت!

نەناسراوە

یەکەم بەرپرسیارێتی سەرکردە ناسینی واقیعە، کۆتا بەرپرسیارێتیشی ئەوەیە کە بڵێ: سوپاست دەکەم، لە نێوان ئەم دوو لێپرسراوێتییەشدا وەکو خزمەتکار کار دەکات.

ماکس دی بری

سەرکردایەتی کاریگەر، ئامادەکردنی وتارو بەدەستهێنانی ڕازیبوونی خەڵك نییە، سەرکردایەتی بە ئەنجامەکانە، نەك بە سیفەتەکانی سەرکردایەتی!

پیتەر دراکەر

مێژوو فێری کردووین، کە مرۆڤ لە مێژووەوە هیچ فێرنابێت.

هیگل

کاتێك بەڕێوەبەر دەڵێت:
بڕۆ، سەرکردە دەڵێت با بڕۆین، ئەمەش سەرکردە لە بەڕێوەبەر جیادەکاتەوە..

ئێی ئێم کیلی

**با سەرکردەکانو هەوادارانی سەرکردایەتی لەگەڵمان بن!**

ئا: تەریمان بەهرام

# کارگێڕی ئیلکترۆنی




بەشی شەشەم

۳-۲ بەراورد لە نێوان کارگێڕی کۆنو کارگێری ئیلکترۆنی:

| سەرۆکی جێبەجێکردنی شێوازی کۆن | سەرۆکی جێبەجێکردنی ئیلکترۆنی |
|---|---|
| - ئازاو بوێرە. | - مووژدەدەرە. |
| - مرۆڤێکی ئاگادارە. | - شڵەژاوە. |
| - بە خۆشەویستانە، بە گیان. | - دەربڕینی بەهێزە. |
| - نیمچە فێرکراو بە تەکنەلۆژیای زانیارییەکان. | - فێرکراوە بە لایەنی کەمەوە لە تەکنەلۆژیای زانیاری. |
| - بە دیقەتێکی ڕوونو ئاشکرا. | - چڕی وردبینی. |
| - جوڵەی خێرایە. | - جووڵەو حەرەکەی زۆر بەپەلەیە. |
| - حەز لە شتی شاراوە ناکات. | - حەز لە شتی شاراوە دەکات. |
| - دووچاری دڵەڕاوکێی بەربەرەکانی تەکنەلۆژیا. | - دووچاری دڵەڕاوکێ بووە لە جێکردنەوەی بوارەکان. |
| - وێنەیەك لە مافی ئۆتۆنۆمی. | - شێوەی لە حکومڕانی نوێ. |
| - تەمەنی (٥٧)ساڵ. | - تـــەمەن (٣٧) ساڵ. |
| - دەوڵەمەندە. | - بەڕاستی دەوڵەمەندە. |

۳- ٥ ئـــەرك و بەرپرسیاریەتی لە کارگێڕی ئیلکترۆنیدا

۳-٥-۱ سەرکردایەتی بەڕێوەبردن:

بۆئـــەوەی گۆڕانێکی ســـەرکەوتوو بۆ کارگێری ئیلکترۆنی بێتە دی، ئامادەکردنی ژمارەیـــەك لە هێزی کاری بە توانا. لە مامەڵەکردنو گونجان لەگەڵ تەکنەلۆژیای پێشکەوتووە بە شێوەی  پێویست. ئەویش بەچوونە پێشتر کۆمەڵێك لێپرسراو بێت.

بێ ئەو توانا گونجاوەی مامەڵە لەگەڵ داخوازییەکانی کارگێڕی ئیلکترۆنی گرانەو بەڵکو مەحاڵە مەبەستەکانی دروستبوونی پرۆژەکانی کارگێری ئیلکترۆنی بێتەدی، ئەگەر تواناو داهاتی مادیو مەعنەویشی بۆ ئامادە بکرێت، لەبەرئەوە کارگێڕی ئەلکترۆنی سەرکردایەتییەکی ڕامیـــاریو بەڕێوەبردنێکی بە هێزی دەخوازێ، بە ئاشـــکرا پەیوەســـت بێ بە هـــاوکاری ئەو هەوڵدانەی سەرئەکێشـــن بەرەو حکومەتێکی ئیلکترۆنی لە ڕوانگەی بەدیهێنانی کاتو کۆشـــشو داهاتو کەشـــێکی ڕامیاریو ئابووریو کۆمەڵایەتیو تەکنەلۆژیا کە بەشـــداری دەکەن لە خستنەگەڕی هێزی کاری دروستو سازو داهێنەر.

## گەندەڵی کارگێڕی

ئا: خەندە ڕەمەزان - زکرا ڕەمزی



# چارەسەری گەندەڵی

بەشی پێنجەم

بەنــدی یەکــەم: ڕووبەڕووبوونەوەی گەندەڵیو چۆنییەتی چارەسەر کردنی:

چارەسەرکردنی دووڕوویی:

• دووڕێگا هەیەو سێیەمی بوونی نییە، ئەمەش ئەمانەن:

- چارەسەری یەکەم: بێدەنگبوون، لەگەڵ چەند زەردەخەنەیەك بۆ بێدەنگکردنی ئەوەی بەرامبەرت.

- چارەی دووەم: دژی بێدەنگی، قسەکردنو دەربڕینی ئەوەی لەناختدا هەیە؛ بەتایبەتی کاتێك بێدەنگی تووشی هەڵچوونی دەروونیودەماریت دەکاتەوە.

- ڕووبەڕووبونەوەی گەندەڵی:

چۆنییەتی ڕووبەڕووبوونەوەی گەندەڵی بە سێ قۆناغ دەبێت، ئەویش بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- ڕێگرتن لە گەندەڵی: ئەمەش وەك شێوازێکی خۆپاراستن بەکاردێت، ئەویش لەسەر بنچینەی ناساندنی ئەم دیاردەیە بە هاوڵاتیانو جۆرەکانیو زیانەکانی لە ڕێی ڕاگەیاندنو ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیو پێگەیاندنی هاوڵاتیان.

٢- ئاشکراکردنی گەندەڵی: ئەمەش وەك شێوازێکی چارەسەر بەکاردێت، ئەویش لە ڕێی بەهێزکردنو کاراکردنی پەرلەمانو ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیو دەزگاکانی ڕاگەیاندن، کە بەشێوەیەکی کاریگەر چاودێری دامو دەزگاکانییان بکەن، ئەو گەندەڵیانەی کە ڕوودەدەن، ئاشکرای بکەن، ئەویش لە ڕێگای ڕاپرسیو شەفافییەت دروستکردنی لە نێوان حکومەتو هاوڵاتیاندا.

٣- ڕووبەڕووبونەوەی گەندەڵی: ئەویش لە ڕێگەی دەرکردنی چەند یاساو ڕێسایەك، پاشان لێپرسینەوەی توند بۆ دیاردەی گەندەڵی، بۆئەوەی ئەم دیاردەیە بڵاونەبێتەوەو دروستکردنی ڕای گشتی خەڵك بۆ دژایەتیکردنی لە ڕێگەی بەکارهێنانی شێوازی سەردەمیانەو یاساییانە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم دیاردانە.

بەندی دووەم:

بنبڕکردنی دیاردەی ڕۆتین لە فەرمانگەکانی حکومەتدا.

١- چاکسازی لە سیستەمی ئیداری حکومەت بەشێوازی (نێت ۆرك).

٢- کەمکردنەوەی کۆبوونەوەکان لە کاتی دەوامی فەرمیدا.

٣- هەموو بەڕێوەبەرایەتییەکان (خزمەتگوزارییەکان) دابەش بکرێن بەسەر چەند تێبینەرایەتییەك بەپێی سنووری جوگرافی گەڕەکەکان.

٤- کۆبوونەوەی بەڕێوەبەرایەتییەکان لەگەڵ بەرپرسی هۆبەو بەشەکان مانگی جارێك، بەشێوەیەکی وەرزی لەگەڵ فەرمانبەران بە گشتی بۆ گوێگرتن لێیانو وەرگرتنی پێشنیاریان.

٥- کارکردنی فەرمانبەران لە هۆڵی کراوەو بینراوداو گۆڕینی سیستمی ژووری داخراو.

٦- هەموارکردنی کۆمەڵێك بڕگەی یاسایی کە بوونەتە دروستکردنی لەمپەر بۆ کاری ئیداری.

٧- چەسپاندنی سیستەمی لامەرکەزی ئیداری لە ناو فەرمانگەکاندا، بەپێی یەکەکارگێڕییەکان.

٨- تەرخانکردنی چەند فەرمانبەرێك بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری هاوڵاتیان لە هەموو دەزگا خزمەتگوزارییەکان بۆ ئەوەی هاوڵاتی خۆی بە دوای کاری خۆیدا نەڕوات.

٩- ئەو فەرمانگانەی پەیوەستن بە یەکەوە لە کاروبارەکانیاندا کۆمەڵگەی فەرمانگە (مجمع دوائر)یان بە یەکەوە بۆ دروست بکرێت بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری هاوڵاتیان بەشێوەیەکی خێرا.

١٠- دەرکردنی یاسایەك بۆ هەموو فەرمانگەکان کە لە ماوەیەکی دیاریکراودا کاری هاوڵاتیان ڕاپەڕێنێت، هەر وەزارەتەو بەپێی ئەرکی خۆی.

١١- هەڵواسینو بڵاوکردنەوەی ڕێنمایی بۆ هاوڵاتیان، سەبارەت بە پێداویستی مامەڵەکانیان.

١٢- دەوامکردن بەدوو شەفت لە دامودەزگا خزمەتگوزارییەکان بە دوو ستافی جیاواز بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری هاوڵاتیان.

١٣- دەستوور نەدانی دامودەزگا ئەمنیەکان لە کاروباری خزمەتگوزارییەکانی هاوڵاتیان.

١٤- لە لایەن وەزارەتی ئەوقافو (یەکێتی زانایانی ئیسلامییەوە) چەند بڵاوکراوەیەك بڵاوبکرێتەوە سەبارەت بە دیاردەکانی (گەندەڵی، بەرتیل،

واسته، ڕۆتین)و هەڵسەنگاندنی لە ڕووی شەرعییەوەو گەیاندنی بە فەرمانگەکان، بەبێ بەرامبەر.

١٥- قەدەغەکردنی مۆبایلو بەکارهێنانی لە کاتی دەوامی فەرمیدا، بەشێوەیەکی گشتی لە لایەن فەرمانبەرانو بەڕێوەبەرانەوە.

١٦- هۆشیارکردنەوەی جەماوەر لە ڕێگەی پرۆگرامەکانی خوێندن، دەزگاکانی ڕاگەیاندن، وتاری مزگەوتەکان، ....هتد، بەهێزکردنی ڕۆشنبیری مەدەنی.

بەندی سێیەم:

دیاردەی (مەحسوبیەتو مەنسوبیەت، (واسیتەو بەرتیل)و بنەبڕکردنی بە هۆی:

١- دەرکردنی یاسای (هەڵسوکەوتی فەرمانبەران)، ئەویش بە پابەندبوونیان بە هەموو بوارەکانی کارکردن.

٢- دانانی سزای دارایی لەسەر ئەو هاوڵاتیانەی کە هانا بۆ بەرتیلو واسیتە دەبەن بە پێی یاسا.

٣- پیادەکردنی سیستەمی سزاو پاداشت لەسەر بنەمای یاسای کار، بەشێوەیەکی دادگەرانە نەك لەسەر بنەمای حیزبیو تەزکیەی کەسایەتی.

٤- هۆشیارکردنەوەی جەماوەر لە ڕێگەی مینبەری مزگەوتەکانو ڕاگەیاندنەکان ..هتد، کە بەرتیلو بەرتیل وەرگرتن، دەبێتە مایەی سزایان لە دونیاو دواڕۆژدا.

٥- پاراستنی نهێنی ئەو فەرمانبەرو هاوڵاتیانەی کە زانیاری لەسەر هاوڵاتیان دەگەیەنن، کە بەرتیلو واستە دەکەنە هۆکار بۆ ڕاپەڕاندنی کاری خۆیان.

٦-فراوانکردنی دەسەڵاتی ڕاگەیاندنەکان، (ڕۆژنامە، تەلەفزیۆن، ڕادیۆ، پێگەکان، .... هتد)، بۆ پەیوەندیکردنی بە داموو دەزگاکانو وەرگرتنی زانیاری لێیانو بڵاوکردنەوەی بەشێوەیەکی شەفافانەو قۆرخ نەکردنی هیچ زانیارییەك.

٧- هەموارکردنی سیستەمی موچە لە ئاستەکانی سەرەوە بۆ خوارەوە، بەشێوەیەك کە جیاوازی گەورە لە نێوان موچەکان نەبێتو ڕەچاوی جۆری کار بکرێت.

٨- دابینکردنی پێداویستییە سەرەتاییەکانی فەرمانبەر بەشێوەی قست، وەك (پێشینەی هاوسەرگیری، یەکەی نیشتەجێبوون، پێداویستی ناوماڵ)، بۆئەوەی فەرمانبەر پەنا بۆ بەرتیل وەرگرتن نەبات.

٩- ئاسانکاری بکرێت بۆ وەرگرتنی شوێنی نیشتەجێبوون بۆ فەرمانبەران، بۆ نموونە خاڵی خزمەتکردنی ژنو مێرد کە هەردووکیان فەرمانبەربن یەك بخرێتو بە یەکەوە خاڵەکانیان بۆ کۆبکرێتەوەو حیساب بکرێت.

**بەشی دووەم/ بەندی یەکەم**

**چۆنیەتی جیاکردنەوەی دەسەڵاتی حیزب لە حکومەت بەم هەنگاوانە:**

١- پارتە سیاسییەکان بەپێی پەیڕەو پرۆگرامو یاساکاری خۆیان بکەنو دەستوەرنەدەنە کاروباری حکومەتەوە.

٢- دیاریکردنی بودجەو داهاتی هەموو حیزبەکانو ئاشکراکردنیان بۆ هاوڵاتیان لە لایەن حکومەتەوە.

٣- نابێت هیچ کەسێك لە یەك کاتدا بەرپرسی حکومیو حیزبی بێت.

٤- نەهێشتنی تەزکیەی حیزبی بۆ دامەزراندنو هەموو کاروبارەکانی تری حکومەت.

٥- چەسپاندنی سەروەری یاسا لە هەموو ئاستو داموودەزگاکانی حکومەت.

٦- دامەزراندنی دەستەیەك لە دادگای تەمیزی کوردستان، کە پەیوەست بێت بە کاروباری دەستوری یاساییو لێپرسینەوە لە پێشێلکارییە یاساییەکانی فەرمانگەکان.

٧- هەڵبژاردنی ئەنجومەنی (نیشتیمانی، پارێزگا، قەزا، ناحیە)کان، هەر چوار ساڵ جارێكو دەسەڵاتی تەواوی خۆیان پێی ببەخشرێتو بەسیستەمێك هەڵبژاردنەکە ئەنجام بدرێت، کە نوێنەری هەموو چینو توێژەکان لە خۆ بگرێت.

٨- کاراکردنی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیو جیاکردنەوەیان لە دەسەڵاتی حزبو دوورخستنەوەیان بە جۆرێك کە دروستکراوو پەراوێزی حیزبەکان نەبنو دیاریکردنی بودجەی سەربەخۆ بۆیان لە لایەن حکومەتەوە.

٩- گۆڕانکاری لە سیستەمی هەڵبژاردن بە شێوەیەك لیستی حیزبەکان بەسەربەخۆ دابەزنو یەکگرتنو ئیئتیلاف دوای هەڵبژاردن بێت بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات.

١٠- ئاشکراکردنی مەوداکانی ئەمنیو قەومی بۆ هەموو لایەك، تاهەمووان ئەرکی خۆی بزانێتو لە لایەن ئەنجوومەنی سیاسی کوردستانەوە دەستنیشان بکرێت.

١١- کۆبوونەوەی ڕاستەوخۆی نوێنەرە هەڵبژێردراوەکانی ئەنجوومەنە هەڵبژێردراوەکان لەگەڵ نوێنەری چینو توێژەکانی کۆمەڵگە بۆ گوێ لێگرتنیانو هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان.

١٢- هەموارکردنی یاسای حیزبو ڕێکخراوەکان بۆ سیستمی (حزبی سنوردار)، وەك لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا پیادە دەکرێت.

١٣- ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی کاریان بۆ کۆکردنەوەی ئەندامو لایەنگرانی نەبێتو سنورداربن، بەڵکو بانگەشە بکەن بۆ خزمەتکردنی ئەو کارەی لەپێناویدا هەوڵی بۆ دەدەن.

بۆ چاکترکردنی سیستەمی دامەزراندنو بەڕێوەبردنی فەرمانگەکان ئەم خاڵانە ئەنجام بدرێت:

١- دروستکردنی سەنتەری (داتا کۆکردنەوە) سەبارەت بەزانیاری لەسەر فەرمانگەکانو ژمارەی فەرمانبەرانو پێداویستی فەرمانگەکان بە فەرمانبەر.

٢- دامەزراندنی فەرمانبەران بەم هەنگاوانەی خوارەوە دەبێت:

- دامەزراندنی یەکەیەکی زانیاری سەبارەت بە مووچە، لە ئەنجوومونی وەزیران کە هەستێت بە تۆمارکردنو کۆکردنەوەی زانیاری هەموو فەرمانبەرانی هەرێمو بەدواداچوونی دووبارە نەبوونەوەی موچە، پاشان دەوامکردن لەداموو دەزگاکاندا.

٣- سنوردارکردنو دیاریکردنی ڕێژەی هێزەکانی ناوخۆو پێشمەرگەو پاسەوان لە لایەن حکومەتی هەرێمی کوردستان، بوار نەدان بۆ زیاترکردنی ئەو ڕێژەیە.

٤- پێداچوونەوە بە سیستەمی خانەنشینی لە هەرێمی کوردستان بەتایبەت بۆ ئەو کەسانەی کە تەمەنیان نەگەیشتۆتە تەمەنی یاسای خۆیو خانەنشینکراون.

٥- وەزارەتی پلاندانان لە هەرێمی کوردستان هەڵدەستێت بە ئەنجامدانی ئەم کارانە:

أ- کۆکردنەوەو گەیاندنی زانیاری سەبارەت بە پێداویستییەکانی کوردستان، بەپێی ماوەی تەمەنی کابینەی حکومەتو کاتی جێبەجێکردن.

ب- خەملاندنی گشتی پرۆژەکانی وەزارەتەکان بە پێی بودجەی حکومەتو کاتی جێبەجێکردن.

ج- ڕیزبەندی پرۆژەکان بە پێی لەپێشینە.

٦- بۆ زیاتر بەهێزکردنی کاروباری حکومەتو دروستکردنی پردی متمانە لە نێوان جەماوەرو حکومەتدا ساڵانە ڕاپرسی سەبارەت بە (أداء الحکومة) لەناو جەماوەردا بکرێت.

٧- هەموو قوتابییان بە گشتی لە کۆلێژو پەیمانگاکان وەربگیرێن، بەڵام بە پێی پێویستی داموو دەزگاکانی حکومەت بێت. بەپێی نەخشەو پلانو پێداویستییەکانی وڵات بێت، نەك لەسەر بنەمای (قبوڵ مەرکەزی).

هاژە شێروانی




# شیکردنەوەی SWOT

دوای ئـەوەی ڕێکخـراو هەڵدەسـتێت بـە هەڵسـەنگاندنێکی سـەرەتایی بـۆ پەیـامو بەهاو ئامانجە سـتراتیژییەکانی، ئـەوا شـیکردنەوەی ژینگـەی دەرەکی بە پێکهاتەکانـیو توخمـە جیاوازەکانـیو ژینگـەی ناوخۆیـی بە هەیکـەلو کلتورو سـەرچاوەکانی پێویسـت دەکات بـە مەبەسـتی دیاریکردنـی هەڵبژاردنـی ستراتیژییە گونجاوەکانی، کە پێیدەوترێت شیکردنەوەی SWOT کە بەم چوار پیتە ئاماژە بە هەر چوار وشـە سەرەکییەکانی دەکرێت کە بریتین لە:

-S- Strengths خاڵی هێز

-W- Weakness خاڵی لاواز بۆ ژینگەی ناوخۆیی

-O- Opportunities هەلەکان

T - Threats- هەڕەشەکان بۆ ژینگەی دەرەکی

سـەرەتای سـەرهەڵدانی دەگەڕێتەوە بـۆ سـەدەی شـانزەهەم لە لایەن (سـەن تزو) ئاماژەی پێکـراوە، لە پەرتووکەکەی (هونەری جەنگ) بە تیشـك خستنە سەر ئەمانەی خوارەوە کە دەبێت:

* دوژمنەکەت بناسیت.

* خۆت بناسیت.

* ئینجا سـەرکەوتنی هەمیشـەییت دەستدەکەوێت.

دوای ئـەوە لـە ماوەی سـاڵانی نێوان (١٩٦٠ —١٩٧٠) پەیمانگـەی سـتانفۆرد بـۆ توێژینـەوە هەڵسـا بـە توێژینەوەی شکسـتهێنانی ئەوەی کە پلانی بۆ دانراوە لە ڕێگای ئەنجامدانی ڕاپرسـییەك لەسەر نزیکەی ٥٠٠٠ بەڕێوەبـەری بەرهەمهێنان لە ١١٠٠ کۆمپانیا کە ئەمەش بەسـەرەتای سەرهەڵدانی SWOT دانرا.

کەواتـە دەتوانیـن پێناسـەی بکەین بـەوەی بریتییـە لـە پشـکنینی خاڵـی هێـزو لاواز لە ناوخۆیـی ڕێکخراو، هەلو هەڕەشـەکان لـە ژینگـە دەرەکییەکـەی. هەرچی خاڵە بەهێزەکانییەتی بریتییە لە توانا ناوخۆییەکانی کە ڕێکخراو هەیەتیو ڕکابەری لەسەر دەکات، خاڵە لاوازەکانیشی بریتییە لە کەمی، یا لە دەستدانی هەندێك لە کارامەییو تواناکانی کە وا لە ڕێکخراو دەکات دەستەوەسـتان بێت لە هەڵبژاردنو جێبەجێکردنی ستراتیژییەك کە پاڵپشتی پەیامەکەی بێت.

ئەوەشـی کـە پەیوەندیدارە بـە ژینگەی دەرەکـی بریتیـن لە هەلەکان کـە بوارێکە لە ژینگەی دەرەکی کە ئەگەر بێت وەبەربهێنرێت لـە لایـەن ڕێکخراو، ئـەوا ئەدایەکـی بەرزی دەبێت بۆی، ئەوەشـی سەبارەت بە هەڕەشەکان بێـت ئەوا ئـەو بوارانەن لە ژینگـەی دەرەکی کە لەوانەیە ئاسـتەنگو تەنگـژەکان لەبەردەم ڕێکخـراو زیاد بکات کە زەحمـەت دەبێت بەم بـارەی بتوانێت کە ئەدایەکـی بەرزو جیاوازی هەبێت.

گرنگی ئەم شیکردنەوەیەش لەمانەدا دەردەکەوێت:

* هەنگاوی یەکەمی بە بەردی بناغەی پرۆسەی پلانی ستراتیژی دادەنرێت.

* وا دەکات کـە ڕێکخـراو پێگەکانی خـۆی بناسـێت لە خاڵـی هێـزو لاوازی ناوخۆو دەرەوەی بە مەبەستی سەرکەوتنی کاریگەری خستنەسەر، یان گۆڕینی ژینگەی دەوروبەری.

* بەرزکردنەوەی ئاسـتی هۆشـیاری ناوخۆیـی بـە خاڵـی هێـزو لاوازی ڕێکخراوەکـەی تـا بتوانێـت ڕووبەڕووی هەڕەشەکان ببێتەوە.

کـە ئـەم شـیکردنەوەیەش وا دەکات کـە تیشـکی زیاتـر بخرێتە سـەر خاڵە بەهێزەکانو سنووردارکردنی لاوازییەکانیو سـوودوەرگرتنی زیاتـر لـە هەلـە بەردەستەکانی. هەر بۆ نموونەش ڕێکخراو بە خاڵە لاوازەکانی خۆی ئاشـنادەبێت بە بوونـی (ئامێرو کەلو پەلـی کۆن، لاوازی چالاکییەکانـی توێژینـەوەو پەرەپێـدان،

تەکنەلۆژیایەکی کۆن، کارگێڕییەکی لاوازو ئاست نزم، شکستی ڕابردوو لە پلاندانان)، هەرچی سەبارەت بە خاڵە بەهێزەکانییەتی ئەوا دەناسرێتەوە لە کاتی بوونی (توانستی بەرهەمـــداری، هێزی کاری کارامە، پشـــکی بـــازاڕی باش، بارودۆخـــی دارایی زۆرباش، ناودەنگی بەرز)، ئەوەشی کە پەیوەندیدار بێت بە هەڕەشەکانی ژینگەی دەرەکی، ئەوا ئەمانە دەگرێتەوە: (ڕکابەری نوێ کە دێتە ناو بازاڕ، کەمی لە سەرچاوە، گۆڕانکاری لە سەلیقەی کڕیارەکان، یاساو ڕێنمایی حکومی نوێ، بەرهەمی ئەلتەرناتیڤ)، ئەوەشی کە وەکو هەل، یا دەرفەتێکە لە بەردەمی، ئەوا دەبێت بە باشـــترین شـــێوە ئاگاداری بێت، وەکو (بوونی بازاڕی نوێ، گەشەی ئابووری، ڕکابەری لاواز، تەکنەلۆژیایەکی پێشکەوتوو لەبەردەســـتی ڕێکخراو، گەشەکردنی خێرا لەم بازاڕەی ئێستادا).

ئەمـــەو ئامانجـــی ســـەرەکی لـــە شیکردنەوەی ناوخۆیی ڕێکخراو بریتییە لە دیاریکردنی توانا جیاکارەکانی بە شـــێوەی خاڵی هێز، کە هەیەتی بە تاکڕەوی تیایدا سەرکەوتوو دەبێت لەسەر ڕکابەرەکانی، کە هەمیشە وادەبێت کە توانای کەمەو ئەگەر کەسێکیش بیەوێت لاســـایی بکاتەوە ئەوا زۆری لەســـەر دەوەســـتێت، چونکە دەبێت ناســـراو بێت بە بەردەوامیو درێژەپێدان پێی، کە ئەمەش سەرچاوەیەکی ناسینەوەی ڕکابەرییەو ســـەرچاوەی ئەم توانایانەشی لەوانەیـــە شـــارەزایی، یـــا ماریفەتێکـــی پســـپۆردار بێت، تا ئەم ماریفەتە شـــاراوە بێت ئەوا تواناکانی باشترینو بەهێزترین داهات دەدات، لەبەر گرنگی ئەم ناسینەوانە لـــە ژیانی ڕێکخـــراوەکانو توانای لەســـەر مانـــەوەو پرۆســـەکانی هەڵســـەنگاندنو پشـــکنینو دڵنیابوون لـــە وەبەرهێنانی بە شـــێوەیەکی دروســـت بۆتە پێشـــینەکانی کارگێڕی ستراتیژی.

کەواتە چۆن شیکردنەوەیەکی باشمان دەبێت؟

١- پێویستە تەنها یەك شیکردنەوەمان نەبێت بۆ ڕێکخراوێکی قەبارە گەورە.

٢- بە وردی گەڕان بە دوای دەستخستنی زانیاری لەســـەر هەموو ڕکابـــەرانو بوارە جیاوازەکانیـــان وەك بەراوردکردن، دانانی بەکاربەری تر، خراپتر لە، باشتر لە...

٣- هاوکاریو هەماهەنگی لە گەڵ ئەم ڕێکخراوانـــەی کـــە هەمان کێشـــەی تۆیان هەیە.

٤- ســـەیرکردنی هـــۆکارەکان نەوەکو دەرەنجامەکان.

٥- جیاوازیکـــردن لـــەوەی کە ئێســـتا تیایدایت لەوەشی کە بەیانی تیای دەبیت.

٦- وردبینی لە دیاریکردنی خاڵەکانو دوورکەوتنەوە لە دووبارەبوونەوەکان.

٧- دیاریکردنـــی ڕوانینـــی هەمـــوو ســـوودمەندەکان لـــە ڕێکخـــراو لـــە ڕووی (ڕوانینیـــان لەســـەر ئـــەدای ڕێکخـــراو، ڕایـــان لەســـەر دەرچـــووەکانو کوالێتـــی پسپۆڕییەکانیان، ئەوەی کە پەیوەندیدارە پێیانـــەوە، گرنگی هەمـــوو ئەمانە لە لای سوودمەندبووان لە چییەوەیە؟).

٨- دوورکەوتنەوە لە ئاڵۆزی، واتا پێویستە کە شیکردنەوەکە سادەو کورت بێت.

لـــە کۆتاییشـــدا بەکارهێنانـــی ئـــەم شـــیکردنەوەیە هەر بـــە تەنها لـــە ژیانی ڕێکخراوەکان ڕۆڵی بەرچاوو دیار ناگێڕێت، بەڵکـــو دەتوانیـــن لە ســـەر ئاســـتی تاکە کەســـیش ســـوودمەندبین لێـــی لەڕێـــگای دیاریکردنـــی خاڵەبەهێـــزو لاوازەکان لـــە کەســـایەتیمانو هەوڵدان بـــۆ پتەوکردنی خاڵـــە بەهێـــزەکانو گۆڕینـــی خاڵـــە لاوازەکانیش بۆ باشی، یان بنەبڕکردنی بە یەکجارەکی، ئاشنابوونیش بەم هەڕەشانەی کە لەســـەر کەســـایەتیمان دروست دەبێت، جاچ لـــە کاریگـــەری فاکتەرەکانی ژینگەی دەرەکی وەك بارودۆخی سیاسیو ئابووریو ڕۆشـــنبیریو کۆمەڵایەتـــیو تەکنەلۆژیـــاو یاســـاو تەشـــریعاتی حکومی بێـــت، یان لە ڕێـــگای ڕکابەریکردنمـــان بێـــت لە ســـەر داهێنانو دەرخستنی ئاستی زیرەکیمان لە خوێندن بە نموونە، یان دوورکەوتنەوە لە یاوەریکردنـــی هاوەڵی خـــراپ کە لەوانەیە زیان بە ئێستاو داهاتووشمان بگەیەنێت!

لـــە پاڵیشـــیدا لـــە هەوڵـــی بەردەوامی دیراسەتکردنو پلاندانان بین بۆ ئەم هەلو دەرفەتانەی کە دێنە بەردەستمانو کارا بین لەوەی کە بە ئاسانی لە دەستمان دەرنەچن، تاوەکـــو بە خێراییو بە کەمترین کۆشـــش بمانگەیەنێتـــە ئامانجـــە دیاریکراوەکانـــی ژیانمـــان کـــە بێگومان دەبێـــت بزانین کە چیمان دەوێـــت؟ چۆنمان دەوێت؟ چۆنیش پێی دەگەین؟ کە بەم سێ پرسیارە سادەیە لە خـــودی خۆمان دەتوانین ئاڕاســـتەکانی ژیانمـــان دیاریبکەیـــنو ڕەوڕەوەی پێشکەوتنمان چاکبکەینەوەو بەرهەمگەلێك پێشکەش بە خۆمانو کۆمەڵگاو وڵاتەکەشمان بکەیـــن، بەمشـــێوەیەش چیتـــر عەودالـــی بەرهەمی بیانیو چاو لە دەســـتی ڕکابەرو دوژمنەکانمان نابین.



# چۆن ڕەخنە لە کارمەندەکەت دەگریت؟

دەتوانیـــت بـــە شـــێوازێکی ئەرێنـــیو نـــەرم، ڕەخنـــەی نەرێنـــیو زبر، ئاڕاســـتەی کارمەندەکانت، یاخود خـــۆت بکەیت. بۆ ئەم مەبەســـتەش، پەیـــڕەوی ئەم چوار یاســـایەی خوارەوە بکە:

١- لـــە دانیشـــتنێکی دووقۆڵیـــدا، ڕەخنەکەتی پێ بڵێ:

ئەمـــەش لەبەرئـــەوەی ئەگـــەر ڕەخنەگرتنەکـــە، لـــە دانیشـــتنێکی تایبەتدا نەبێتو بە ئاشکراو لەبەرچاوی کارمەندەکاندا بێت، وا لەو کارمەندەو ئەوانی دیکەش دەکەیت، لەسەردانو دانیشتن لەگەڵتدا بترسنو سامیان لێ بنیشێت.

٢- بـــەدەمو زاری خۆت ڕەخنەکەی لێ بگرە:

نەکەی بە یاداشـــتو نووســـین، یاخود بـــە ئیمەیڵ (نامـــەی ئەلیکترۆنی)، ڕەخنە لە کارمەندەکـــەت بگریت، چونکە زۆر ئاســـانە، خراپ لێکبدرێتەوە. سا لەبەرئەوە ڕاستەوخۆو ڕووبەڕوو، ڕەخنە لـــە کارمەندەکەت بگرە، تا دەرفەتی پرســـینو وەڵامدانەوەی ڕەخنەکانتی بۆ بڕەخسێت.

٣- وشەی (تۆ) بە خراپەو نەرێنی ڕیز مەکە:

بـــۆ نموونە: (تۆ نـــا....)، (وا دیارە، تۆ توانـــات بەســـەر..... ناشـــکێت). بەکارهێنانی وشەی (تۆ)، کارمەندەکە دەخاتە ناو هەڵوێستی بەرگـــری لە خۆکردنـــەوە. لەبەرئەوە لە بری (تـــۆ)، (من) بەکار بهێنە. بـــۆ نموونە: ئەگەر ڕاپۆرتی کارەکەی نەناردبوو، پێی بڵێ: (هێشتا مـــن.. ڕاپۆرتەکەتم بەدەســـت نەگەیشـــتووە)، یـــان بڵێ: (وا دێتە پێـــش چاوم، گرفتێکت بۆ هاتووەتە پێش).

٤- ڕەخنەگرتنەکـــەت بـــە وشـــەی (هەمیشـــە، هەرگیز، خراپتریـــن، ...) گیرترو ئاڵۆز مەکە:

بـــۆ نموونە: (تۆ هەمیشـــەو بەردەوام.. هـــەر ئـــەو هەڵەیـــە دەکەیتـــەوە)، یـــان (وا دەردەکەوێت، هەرگیز بەڕاســـتو دروســـتی لە کاروبارەکان حاڵی نەبوویت)!

# ٥٠٠ بیرۆکەی قەشەنگ بۆ ڕێکخستنی هەموو شتێک




ن: شێری بایکۆسفی..
و. بۆ عەرەبی: محمد عنان..
و. بۆ کوردی: زانکۆ قەرەداغی

## چاکترین شێوازو کەرەستە بۆ ڕێکخستنی ژیانت، لە ئۆفیسو ماڵ، لە کاتی خوێندنو کارو سەفەرو بازاڕدا...

**١٧- ڕۆژ لە دوای ڕۆژ:**

پابەندبوون بە سیستەمەوە پرۆسەیەکی زیندووی بەردەوامە، نەك چەق بەستوو، خۆت لەسەر ئەوە ڕابهێنە کە ڕۆژانە چارەگە سەعاتێك خۆت بە ئەرکێکەوە خەریك بکەیت، کە زۆر لەوانی تر گرنگترو لە پێشتر بێت، تا بە تەواوی بە ئەنجامی دەگەیەنیت، ئەگەر ڕۆژێك بیرت چوو ئەوا ڕۆژی دوایی بەردەوامبەو ڕێگە مەدە لە یادت بچێت، ئا بەوجۆرە تایبەتکردنی کاتێکی دیاریکراو ڕۆژانە پابەندت دەکات، بە پرۆژەکەتەوە، ڕەنگە ئەمە جۆرێك لە دڵگەرمیت بۆ دروستبکاتو بە زووترین کات تەواوی بکەیت.

**١٨- لە هەموو شوێنێکدا پێنووسێك دابنێ:**

بۆئەوەی بۆ پێنووس دانەمێنیت، لای کەمەکەی لە هەر ژوورێکدا، لە جێگەیەکی دیارو بەرچاودا پێنووسێك دابنێ، چاکتر وایە لەگەڵ پێنووسەکەش پارچە کاغەزێك هەبێت، لە چێشتخانە لەسەر دەرگای بەفرگرەکە پێنووسێك جێگیر بکە، ڕەنگە بەخت یاوەرت بێتو لە بازاڕدا پێنووسێکت بەرچاوبکەوێت، سەرێکی پێنووسو سەرەکەی تری کلیلی ساردی، یان قوتو هەڵپچڕین بێت.

**١٩- میمۆرییەکی تر:**

لیست دروستکردن بنچینەی هەموو پرۆسەیەکی ڕێکخستنە، چۆن دەتوانیت میمۆرییەکی زیادە بۆ کۆمپیوتەرەکەت دابنێیت، هەر بەو جۆرە دەتوانیت کۆمەڵێك لیست بۆ خۆت دروستبکەیت، کە توانای بیرهاتنەوەت فراوانتر دەکات، هەر کاتێك بیرۆکەیەکی باشت بۆ هات، ئەگەر گونجا یەکسەر جێبەجێی بکە، یان لە نامەکەتدا بینووسە، نووسینی ئەم جۆرە بیرۆکانە یارمەتیت دەدات، بۆ لە بیرنەچوونەوەو جێبەجێکردنیان لە زووترین کاتی گونجاودا، مێشکیشت ئازاد دەبێت بۆ بیرکردنەوە لە شتی تر..

**٢٠- سەرلەنوێ ڕێکخستنەوە:**

کۆشش بکە، هەمیشە بە هەڵسەنگاندنی شتە ڕۆتینەکانی هەڵسوکەوتی خۆتا بچۆرەوە، بە تایبەت ئەگەر هەستت کرد کاریگەری نێگەتیفیان لەسەر بەرهەمهێنانت هەیە، بۆ سوودوەرگرتنی زیاتر لە کات نەرمونیانی مەرجێکی گرنگە، لە ڕاستیدا چاك وایە، ئەو وتەیە بەراستبزانین کە دەڵێت: گۆڕان تاقانە نەگۆڕە لە بواری ڕێکخستندا، هەروەك تاکە جێگیرە لە بواری ژیاندا.

**٢١- بنەمای جێگیر نییە:**

ئەو شێوازە بەکاربهێنە کە پێتوایە گونجاوترینە بۆ تۆ، بە شێوازی خۆت کارەکانت ڕێکبخە، هیچ بنەمایەك نییە ڕێگری بکات، لەوەی کە چەرچەفەکان لە ناو کەنتۆری جلوبەرگدا دابنێیت، یان کراسو پانتۆڵ پێکەوە قەد بکەیت، یان لە تیانووسی ناونیشانەکاندا بیرۆکەی پرۆژەیەك بنووسیتەوە... هتد.

**٢٢- لە جارێك زیاتر:**

وتەیەکی چەواشەکار هەیە، دەڵێت: گوتارێك هەر یەکجار گوێی لێدەگریتو نووسراوێك هەر جارێك دەخوێنرێتەوە، بەڵام ڕێکخەرە پسپۆڕەکان لەسەر نادروستی ئەم ئامۆژگارییە یەکدەنگن، چونکە ڕەنگە زیاتر لە جارێك پێویستت بە پێداچوونەوەی ئاگادارییەك، یان گوتارێك هەبێت، ئەوەی کە پێویستە لەسەرت ئەوەیە کە هەست بکەیت لەم پێداچوونەوەیە ئەنجامی چاکترت دەستدەکەوێت، تەنانەت دەتوانیت لەسەر ئەو وتارە، یان ئاگادارییە بنووسیت، (بۆ پاراستن لە دۆسیەیەکدا).

### چالاکییەکان

**٢٣- تا لە یادت نەچێت:**

دۆسیەیەك دروست بکە، بۆ پاراستنی ئاگاداری ئەو چالاکیانەی لە داهاتوودا دەکرێنو پێتخۆشە هاوبەشییان تێدا بکەیت، وەك (پێشانگا، زەماوەند، گەشتو گوزار، وانەوتنەوە، ....)، لە لیستی ژوان (موعد)ە گرنگەکانت تۆماریان بکەو بە

ڕەنگێکی جیاواز دیاریان بکە، تا بە ئاسانی بیانبینیتەوە، دەتوانیت لە بەردەم هەر یەکێکیاندا بنووسیت (سەیری دۆسیەکە بکە)، تا یادت بێتەوەو لێیان ئاگادار بیت، ئەم دۆسییەیە لەگەڵ دۆسییەی چالاکییەکانی تردا بپارێزە، هەوڵمەدە لە تەواوی ئەم چالاکیانەدا بەشداری بکەیتو ناوبەناو سەیری دۆسییەکە بکەو هەر بەسەرچووبوو لای ببە.

٢٤- کارتی بەشداری:

کاتێک کارتی بەشداری وێنەیەک وەردەگریت، یان دەکڕیت، وەک یارییەکی تۆپی پێ، یان ئاهەنگێک، ئەم کارتە لەناو جزدانی پارەکانت، یان لە هەر جێگەیەکی تری بەرچاو دابنێو بەروارەکەی لە لیستی کارە گرنگەکانتدا تۆمار بکەو بەرامبەری بنووسە، کارتەکەت لە یاد نەچێت، ئەگەر هەستت کرد ئەگەری لەبیرچوونی هەیە.

٢٥- بەرێکوپێکی ئامادەکراو:

ئەگەر خوت بە مەشقکردنەوە گرتبوو، لە یانەیەکی وەرزشیدا، ئەوا تۆ پێویستت بە جانتایەکی تایبەت دەبێت، چاکترین جۆر بۆ ئەم کارە، جانتایەکی شەش پاڵووەو تایبەتمەندی باشی خۆی هەیە، بەشبەشکراوەو جێگای جلی پاکو پیس جیایەو جێگەی تایبەتی تیایە بۆ شتی بە نرخو دەفتەری تێبینیو تاقمی تەراشو بوتڵی ئاو، شوێنی پێڵاوی وەرزش، لەم جانتایەدا کونکراوە تا هەوا بکێشێتو بۆن نەکات، ئەم جانتایانە وا دروستکراون لە ژێر کورسی فڕۆکەو پاسی سەفەرو سەر ڕەفەو ناو سندوقی ئۆتۆمبێلدا بە ئاسانی جێگەی دەبێتەوەو هەندێکیان جێگای تۆپو ڕێکتەی تێنسیان هەیەو دەسکێکی وایان هەیە کە کورتو درێژ دەکرێت، دانەیەکی گونجاو لەم جانتایە بۆ خۆت هەڵبژێرە..

٢٦- گرفتی دەرزی تریکۆ، یان قولاپی چنین:

ئەگەر لە کاتی کڕینو دانانی لەناو جانتای بازاڕەکەتدا قولاپی چنین بووە، هۆی کونکردنی ئەو جانتایە، ئەوا کارێک بکەو بچۆ دووکانێک کە شتومەکی چنینو نەخش دەفرۆشێت، لەوانەیە لەوێ بەخت یاوەرت بێو جانتایەکی تایبەت بە دەرزیو قولاپی چنین پەیدا بکەیت، ئەگەر دەستت نەکەوت خۆت دەتوانیت جانتایەک بۆ ئەو مەبەستە ساز بکەیتو چەند گیرفانێکی لە دیوی ناوەوە هەبێت، بۆ پاراستنی قولاپو دەرزیو کەلوپەلی دیکەش.

٢٧- ئایا ماوەیەکی زۆرە، کە تۆ دەرزیو قولاپی چنین بەکاردەهێنیت؟

ئایا ئەو بووکەڵەیەی بۆ منداڵەکەت دروستکردبوو، لەسەر شێوەی مرۆڤێک، ئێستا پانزە ساڵ بەسەر دروستکردنیدا تێپەڕیوە؟

ئایا ماڵەکەت پڕبووە بە نموونەی ئەو فڕۆکەو کارە هونەریانەی کە ئارەزووی دروستکردنیانت هەبووە؟

لەگەڵ خۆتا ڕاستگۆ بە، تۆ ئێستا گەورە بوویت، تەمەنت چۆتە سەر، منداڵێک بدۆزەرەوە کە ئارەزوومەندی ئەو جۆرە کارانە بێتو ئەو شتانەی بە دیاری بدەرێ، یان دامەزراوەیەکی خێرخوازی بدۆزەرەوەو شتەکانتی پێببەخشە.

٢٨- شوێنێک بۆ ڕەفەی زیاتر:

لە بری بەکارهێنانی جانتای تریکۆو پاراستنی ئەو شتانەی بە کەرەسەی تریکۆ دروستتکردوون، بیر لەوە بکەرەوە چەند ڕەفەو تاقێک بۆ ئارەزووەکانت دابین بکەیت، دەتوانیت هەر ڕەفە، یان تاقێک بە چەند جیاکەرەوە (پارتیشن)ێک بەشبەش بکەیتو هەر ئارەزوویەکت بەشی خۆی بۆ دابنێیت، مێزێک، یان دۆڵابێک وەک وەرشەی کارکردن بەکاربهێنە، ئەگەر لە ئارەزوویەک زیاترت هەبوو، دەتوانیت سەنتەرێکی تایبەت بە خۆت دروست بکەیت لە مێزێکو چەند ڕەفەو دۆڵابێک.

٢٩- ئەگەر سیدی (CD) زۆرت هەبوو:

ئەگەر ڤیدیۆ سیدیت هەبوو، لە کاتی سەیرکردن، یان گوێگرتن لە هەر سیدییەک بەرگی سیدییەکە لە نزیک خۆت دابنێ، تا بزانیت گوێ لە کام سیدی دەگریت، هەرئەمەش یارمەتیت دەدات کە هەر سیدییەک بگێڕیتەوە ناو بەرگی تایبەت بە خۆی، ئەم کردارە لەگەڵ شریتی تەسجیلو زۆرشتی تریشدا بەسوودە.

٣٠- دەزگای ڤیدیۆو سوودوەرگرتن لە کات:

دەزگای ڤیدیۆ داهێنراوێکی زۆر بە سوودە بۆ ڕێکخستنی سەیرکردنی بەرنامەکانی TV، بە جۆرێک کار ئاسانیت بۆ دەکات، کە سەیری هەر بەرنامەیەک بکەیت لەو کاتەی کە بۆت دەگونجێت، بۆ نموونە ئەگەر سەیری بەرنامەیەکی دیاریکراوی TVیت دەکردو لەو کاتەدا زەنگی تەلەفۆن، یان مۆبایلەکەت لێیدا، ئەوا دەستبەجێ سوود لە دەزگای ڤیدیۆکەت وەربگرە بۆ تۆمارکردنی ئەو بەرنامەیەو دوای وەڵامدانەوەی تەلەفۆنەکەت سەیری ئەو بەرنامەیە بکە بە تۆمارکراوی، یادت نەچێت بەرنامەی تۆمارکراو ڕێگای ئەوەت دەدات لە کاتی سەیرکردنی ڤیدیۆکە ڕایبگریتو بچیت هەرکارێک کە دەتەوێت ئەنجامی بدەیتو دواتر سەیری بەرنامەکە بکەیت.

٣١- کورتکردنەوەی شریتی ڤیدیۆ:

شریتی ڤیدیۆ کاتێکی زۆرمان بۆ دەگێڕێتەوە، ئەویش بە تۆمارکردنی فیلم، یان پرۆگرامێکو دواتر سەیرکردنی کە دەتوانیت بە پاڵنانی شریتەکە لە کاتی ڕیکلامو هەندێک دیمەنی تردا لە کاتێکی کەمتردا ئەو فیلمە، یان بەرنامەیە ببینیتو سوود لە زیادەی کاتەکە وەربگریت بۆ بیرکردنەوە لە گیروگرفتێکو دۆزینەوەی چارەسەر بۆی.

٣٢- دەربارەی فیلمو بەرنامەی ئەمشەو چی؟

ئەگەر دەزگایەکی ڤیدیۆیی پێشکەوتووت هەبوو، کە بتوانیت بە هۆیەوە بە پێی ویستی خۆت لە ڕێی دەزگای ڕێکخستنی کاتو تۆمارکردنی ڤیدیۆکەوە بە شێوەی ئۆتۆماتیک ئەو بەرنامانە لەسەر شریتێک تۆمار بکەیت، کە حەزت لێیەتی، ئەوا دەتوانیت ئەو بەرنامەو فیلمانە لە هەر کاتێکی تردا سەیر بکەیتەوەو بشزانیت سەیری چی دەکەیت، دوای تەواوبوونی ئەو شریتە ناوی هەموو مادەو پرۆگرامەکانی لەسەر بنووسەو لە شوێنێک بیپارێزەو شریتێکی دیکە لە ناو ڤیدیۆکەدا دابنێ، بە مەبەستی تۆمارکردنی بەرنامەو پرۆگرامی دیکەو سوود وەرگرتن لێی وەک مادەی شەو.

٣٣- جیاکردنەوەی کەناڵەکانی تەلەفزیۆن:

ئەگەر لە وڵاتێکدا ژیای کە خزمەتگوزاری تەلەفزیۆنی لە ڕێگای کێبڵەوە تیابوو، ئەوا هەوڵ بدە، ناوو پاسۆردی تەواوی کەناڵەکانی کێبڵی تەلەفزیۆنەکە بزانیتو لیستێک بە ناوی ئەو کەناڵانەوە دروست بکە کە پێت باشە، سەیریان بکەیت، لە نزیک تەلەفزیۆنەکەتەوە هەڵیواسە.

٣٤- فیلمە خۆشەکان:

ئەگەر کۆمەڵێک فیلمت هەبوو، لەسەر شریتی مۆدێل کۆنی ڤیدیۆ، ئەوا بزانە ئەو شریتانە ئەگەری تێکچوونو لەناوچوونیان هەیە، بە هۆی کۆنیو باونەمانیانەوە، چاکتر وایە ئەو فیلمو بەرنامانەی لەسەر ئەو شریتە کۆنانە هەن بیانگوێزیتەوە بۆسەر شریتی مۆدێلو تازەی ڤیدیۆ، یان بخرێنە سەر سیدی، تا لە تیاچوون پارێزراو بن.




سەرکردایەتی هونەرە، سەرکردەی لێهاتوو، وەکو هونەرمەندێکی خاوەن ئەزموونو لێهاتوو وایە، خەڵکی دەیبینن و کەمەندکێشی دەبن، زۆرجار هەوڵ دەدەن لاسایی قسەو جوڵەو حەرەکاتی بکەنەوە، ئەو ئەکتەرە، سەرنجی دەوروبەری بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت.

هەروەکو چۆن ئەکتەر بوونی نییە بەبێ جەماوەر، بە هەمانشێوە سەرکردەش بەبێ شوێنکەوتووان بوونی نییە، هەر کات بە هۆی هەڵسوکەوتەکانییەوە سەرسامی شوێنکەوتووانی زیاد کرد، هەرکات شوێنکەوتووەکانی حەزیان بە لاساییکردنەوەی ڕەفتاری سەرکردەکەیان کرد، ئەوکات دەبێتە کەسێکی داناو لێهاتوو لە دەرکردنی بڕیارو دانانی بەرنامەی ستراتیژی کارنامەیدا، دەبێتە ڕابەرو ئامۆژگاریکارو کەسێکی دیاری شوێنەکەوتووانی.

لێرەدا ٥٠ ئامۆژگاری پێشکەش دەکەین، تا ببیتە سەرکردەیەکی لێهاتوو بە توانا، ڕابەرێکی خۆبەکەمزان، بۆئەوەی ببیتە پێشەوایەکی چاکو بەناوبانگ بۆ دەوروبەرت:

١- لەگەڵ شوێنکەوتووەکانتدا وەکو هاوڕێ مامەڵە بکە، نەك وەكو ناچاریو ڕاییکردن.

٢- لە دانانی ئامانجەکانی دامەزراوەکەتدا، هاوبەشی بە شوێنکەوتووانت بکەو ڕاوێژیان پێ بکە.

٣- هەموو شتێك بنووسەرەوە، نووسین دەرمانی دەردی لە بیرچوونە.

٤- شوێنکەوتووەکانیشت فێر بکە، کە هەموو شتێك بنووسنەوە، چونکە هەموومان مرۆڤین، دەشێت دووچاری لەبیرچوونەوە ببین.

٥- ئەگەر دەتەوێت گوێڕایەڵیت بکەن، ئەوا فەرمان بە شتێك بکە کە لە توانایاندا بێت، ئامانجو پلانێك دابنێ کە شایستەی جێبەجێکردن بێت.

٦-سەرکەوتنو بەدەستهێنانی ئامانجەکان، بخەرە ئەستۆی شوێنکەوتووەکانت، بەڵام هەموو شکستێك بخەرە ئەستۆی خۆت، پێش ئەوەی بیخەیتە ئەستۆی هەر کەسێکی دی.

٧- بۆ هەموو شتێك وێنایەك دابنێ، هەموو هەنگاوێك ئامار بکە، تەنانەت ئەگەر ڕوودانیشی دوور بێت.

٨- فەرمانبەری باشو گونجاو لە شوێنی باشو گونجاو دابنێ.

٩- شوێنکەوتووانت هان بدە تا هەندێکیان ئامۆژگاریو ڕێنمایی هەندێکی تریان بکەن..

١٠- ببەخشە پێش ئەوەی وەربگریت، پێشکەش بکە، پێش ئەوەی داوا بکەیت، فەرمانبەرەکانت لە کارەکانیاندا خۆیان ماندوو ناکەن، تەنها کاتێك نەبێت کە هەست دەکەن ڕێزیان دەگیرێت.

١١- وەڵامدانەوەی پێویستییەکانی کەسانی دەوروبەرت، بخەرە پێش پێداویستییەکانی خۆتەوە.

١٢- کارەکەت خۆشبووێت، چونکە هەر کەس کارەکەی خۆشنەوێت، هەرگیز کار ناکات.

١٣- خۆت بە گەشبینیو ئەرێنی بڕازێنەرەوە، تا کارە قورسەکانیشت لەلا ئاسان بێت.

١٤- ڕێزی بیروبۆچوونی کەسانی دی بگرە.

١٥- یارمەتی شوێنکەوتووانت بدە، لەسەر پەرەپێدانو پێشخستنی شارەزاییو لێهاتووییان.

١٦- غیرەتو ئازایەتیو بوێری لە ناخی شوێنکەوتووانتدا بڕوێنە، لە گفتوگۆو مشتومڕدا، لە پرسیارکردن سەبارەت بە هەموو کاروبارەکانی کارکردن. تا بتوانن بە وردی وەریبگرن، هەموو شتێکیان بە ئامادەکراویی مەدەرێ، بەبێ سوود، وەکو ژەمە خێراکان.

١٧- لە هەڵەکان چاوپۆشی بکەو لە هەڵەکار ببورە، چونکە هەڵە ڕێگەیەکە بۆ فێربوون.

١٨- هانیان بدە بۆ کۆڵنەدانو بەردەوامیو دووبارە هەوڵدان ئەگەر شکستیان هێنا، چونکە دووبارە کردنەوەی هەوڵەکان دەتگەیەنن بە سەرکەوتن.

١٩- بە حیکمەتەوە هەڵسوکەوت بکە، ئەگەر کەسانی دیش ژیریان ونکردبوو، بۆئەوەی دەستبگرن بە گوریسی فەرمانەکانەوە.

٢٠- زمانت بپارێزە، بزانە کە جەستەش زمانی ڕوونو ئاشکرای خۆی هەیە، لە بری تۆ قسە دەکاتو پەیامت دەگەیەنێت بە هەمووان.

بەشی یەکەم



و: محەممەد مێرگەیی

# ٣٠ ڕێگە بۆ سەلامەتیی منداڵان لەسەر ئینتەرنێت

١- پێش ئەوەی دەست بکەیت بە بەکارهێنانی ئینتەرنێت، لەگەڵ (دایەو بابە) چەند بنەماو ڕێنماییەکی بەکارهێنانی ئینتەرنێت دەستنیشان بکەن.

دەستنیشانی ئەوە بکەن ڕۆژانە چەند کات بۆ تۆ گونجاوە بۆ بەکارهێنانی ئینتەرنێت؟ هەروەها زانینی ئەوەی کە دەکرێت تۆ چی ئەنجام بدەیتو ئەوەی ناکرێت ئەنجامی بدەیت؟ دوای زیاتر ئاشنابوونت بە ئینتەرنێت، تۆو دایەو بابەت دەتوانن جارێکی تر قسە بکەن لە بارەی گۆڕینی بنەماو ڕێنماییەکانەوە. ئەمانە لە نزیک کۆمپیوتەر دابنێ، بۆ ئەوەی لە کاتی پێویست بە ئاسانی بگەڕێیتەوە بۆیان.

٢- وشەی نهێنی تایبەت بە خۆت مەدە بە کەس.

٣- پێش بەشداریی کردنت بە هەر زانیارییەکی تایبەت بە خۆت لەسەر ئینتەرنێت، تکایە سەرەتا لەگەڵ دایەو بابەت ڕێکبکەوە.

٤- پێش ئەوەی دوگمەی Enter دابگریت، زیاتر لە جارێك پێداچوونەوەیەکی زمانەوانییو ورد بکە بۆ بەستەرو لینکی (ناونیشانی ماڵپەڕ) ئەو ماڵپەڕەی ئارەزوو دەکەیت سەردانی بکەیت، تاوەکو دڵنیابیت لە تەواویو دروستیی پیتەکانی ناونیشانی ماڵپەڕەکە. ئەمە یارمەتیت دەدات بە ئاسانیو بەبێ هەڵە بگەیت بەو ماڵپەڕەی کە دەتەوێت نەوەك ماڵپەڕێکی تر.

٥- پێش ئەوەی بچیتە ناو ژوورەکانی چاتکردن، پشت ببەستە بە (دایەو بابە)ت، یان کەسێکی بە تەمەنتر لە خۆت کە متمانەی پێدەکەیت. ژوورەکانی چاتکردن جۆراوجۆرن، هەم لەبارەی ئەوانەی بەشداریی تێدادەکەن، هەروەها لە بارەی یاساکانیانەوە. لەگەڵ دایەو بابەت، پێش چوونە ناو ئەم ژوورانە، دڵنیابن لەوەی کە ژوورەکان سەلامەتنو ناوەڕۆکی زیانبەخشیان تێدا نییە.

٦- ئەگەر لە هەر ماڵپەڕێك، ناوەڕۆکێکی زیانبەخشت بینی، ئەوا دەستبەجێ ئەم ماڵپەڕە بەجێبهێڵەو یەکسەر ئەمە بە دایەو بابەت، یان مامۆستاکەت بڵێو ئاگاداریان بکەرەوە.

٧- بەبێ ئاگادارییو ڕەزامەندیی دایەو بابەت، هەرگیز وێنەیەکی کەسیی تایبەت بە خۆت لە ڕێگەی پۆستی ئەلیکترۆنی (ئیمەیڵ) بۆ هیچ کەسێك مەنێرە.

٨- ئەگەر نامەی ئەلیکترۆنی نەشیاوو نەخوازراوت پێدەگات، بۆ نموونە نامەی هەڕەشە، یان تەنگ پێهەڵچنین، ئەوا وەڵامی ئەمجۆرە نامانە مەدەرەوەو دەستبەجێ دایەو بابە، یان کەسانی لە خۆت گەورەتر ئاگاداربکەوە.

٩- ئەوەت لە یاد بێت، هەموو ئەوەی لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت دەیخوێنیتەوە، ڕاستو دروست نییە.

١٠- بەبێ ئاگاداری دایەو بابەت تەمەنی خۆت مەدرکێنە.

١١- ناوی تەواوی خۆت (یەکەمو کۆتایی) ئاشکرا مەکە، ناوی یەکەمت مەدە بەبێ دڵنیابوون لەگەڵ دایەو بابەت لە سەرەتادا.

١٢- لەڕێگەی ئینتەرنێتەوە، ناونیشانی ماڵی خۆتان مەدە بە کەس.

١٣- پرسوڕا بە دایەو بابەت، یان بە کەسانی بە تەمەنتر لە خۆت بکە، پێش ئەوەی واژوو لەسەر هیچ شتێك بکەیت لەسەر ئینتەرنێت.

١٤-کارتی کەسیی تایبەت بە بانق (ئەگەر هەبێت) بە کەس مەدە بەبێ ڕووخسەت وەرگرتن لە دایەو بابەت.

١٥- ئەوەت لە یاد بێت: کاتێك ئینتەرنێت بەکاردەهێنیت، ئەوا هەموو ئەوەی ئەنجامی دەدەیت، دواجار بۆ تۆ دەگەڕێتەوە، هیچ شتێك مەکە کە حەز لە ئەنجامدانی ناکەیت.



# باشترین شێواز لە نووسینی گازندەدا

ئا: ئەسکەندەر ڕەحیم

هەندێجارلەگەڵ کۆمپانیایەکدا، یان لەگەڵ ئەو دەزگاو لایەنانەی هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکەیت، بەرەنگاری هەندێك گرفت دەبیتەوە، کە ناچارت دەکات، پەیامی گازندەو سکاڵا بنووسیت، بۆئەوەی مافی خۆت بەدەست بهێنیت.. بەڵام نووسینی ئەو پەیامە گازندەئامێزانە، بنەمای خۆیان هەیە. لەبەرئەوە پێویستە لە کاتی نووسینی گازندەدا، پەیڕەوی لە شێوازێکی کورتو پیشەییانە بکەیت، ئەویش بە جێبەجێکردنی ئەم یاسایانەی خوارەوە:

**١- تەنها لەبارێکدا گازندە پێشکەش بکە، کە شایستەی گازندەکردن بێت:**

خۆ ئەگەر یەکێك بوویت لەو کەسانەی بەردەوامو دووبارە، گازندە لە دوای گازندە پێشکەش دەکەیت، ئەوا کەسێك شك نابەیت، گوێ بۆ گازندەکانت شل بکات.

**٢- گرفتەکە دەستنیشان بکە:**

سەبارەت بەو بارو هەڵوێستەی بێزاری تۆی خرۆشاندووە، تا وردەکاری زۆرتر بخەیتە ڕوو، ئەوا بایەخی ئەو لایەنەی گازندەی لا دەکەیت، زۆرتر دەبێت.

**٣- ئامانجی گازندەکەت دەستنیشان بکەو ڕاستیخوازو دادگەریش بە:**

ڕەنگە وەك قەرەبووکردنەوەیەك، حەز بە وەرگرتنەوەی بەشێك لەو پارەیەی لە سەروبەندی کڕیندا داوتە، بکەیت. لەوانەشە پێتخۆش بێت، کۆمپانیا بە هەموارکردنی بڕێك ڕێوشوێنی تایبەت، بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ کڕیاراندا. ڕێشی تێدەچێت لە بەڕێوەبەری فەرمانگەیەك، یان بەڕێوەبەرێکی گشتی، داوای گێڕانەوەی مافێك، یان خزمەتگوزارییەك بکەیت. لێرەدا دەبێت، بەپێی ئەو زیانەی پێتگەیشتووە، یان پێت دەگات، بیرێکی باش لەو قەرەبووە گونجاوەی بۆت ئەنجام بدرێت، بکەیتەوە، بەبێئەوەی زێدەڕۆیی لە دەسەوام، یان قەرەبوودا بکەیت.

**٤- گازندەکەت بۆ کەسی شایستە بنێرە:**

پێویست ناکات، گازندەکە بۆ ناونیشانی ئەلیکترۆنی، گشتیی دەزگاکە بنێریت، بەڵکو بە دوای کەسو بەشی شیاوی دەزگاکەدا بگەڕێو ڕاستەوخۆ گازندەکەتیان بۆ بنێرە.

**٥- ئەو زمانی نووسینە بەکار بهێنە، کە بە زمانی پیشەیی دادەنرێت:**

وێڕای پەستو بێزاریت، لە بەرامبەر ئەو مامەڵەیەی لەگەڵتدا ئەنجامدراوە.. بەڵام هەرگیز ئەنجامی دڵخوازی خۆت ناگەیت، ئەگەر لە گازندەو سکاڵاکەتدا، جوێنو سەرنجی منداڵانەو قسەی نابەجێت، نووسیبوو. لەبەرئەوە پێویستە، بە زمانی پیشەییانەوە پابەند بیت.

**٦- گشتاندن مەکەو تەڕو وشك، پێکەوە مەسوتێنە:**

بە وردی ئەو بارو هەڵوێستەی بۆت هاتووەتە پێش، ڕوون بکەرەوەو سەبارەت بەو شتەی هزروهۆشی خرۆشاندوویت، بدوێ.

**٧- ناونیشانو چۆنێتی پەیوەندیکردن پێتەوە بنووسە:**

هەرگیز گازندەو سکاڵای بێناونیشان پێشکەش مەکە. ئەگەر بەڕاستیش دەتەوێت ئەنجامی چاكو ئەرێنی بەدی بهێنیت، ئەوا ناوو ناونیشانی ئیمەیڵو ژمارەی مۆبایلەکەت، لە گازندەکەدا بنووسە.

**٨- دانوسانو وتوێژ بکە:**

ئەگەر ئەو گازندەیەی پێشکەشت کرد بوو، ڕەتکرایەوە.. ئەوا لە ڕێچارەی دیکە بپرسە. خۆ ئەگەر ڕێچارەی دیکەت خرایە بەردەم، واچاکە پێش پەسەندکردنی ڕێچارەکە، جوان سەرنج بدەیتو باش بیری لێ بکەیتەوە، چونکە ئەگەر پەسەندت کرد، ئەوا وا لێك دەدرێتەوە، کە بابەتی گازندەکە چارەسەر کراوەو بڕاوەتەوە.

**٩- بە دوای کاروباری گازندەکەتدا بچۆو لێی بپرسەوە:**

بەپێی ئەو دەزگایەی گازندەکەت لەلا کردووە.. پێویستە لە ماوەی دوو هەفتە، یان سێ هەفتەدا، بەدواداچوون بۆ گازندەکەت بکەیتو پێویستە بزانیت چی بەسەر هاتووەو بە چی گەیشتووە.

**١٠- ئەگەر وەڵامت دەست نەکەوت، گازندەکەت بەرەو کەسانی سەرتر ببە:**

ئەگەر زۆرتر لە جارێك، هەوڵی پەیوەندیکردنت بە دەزگاکەوە داو کەڵکی نەبوو، ئەوا کاتی ئەوە دێ، کاروبارەکەت بەرەو سەرتر ببەیتو سەرباری ناونیشانی جێگری سەرۆك بەشی گازندە، بەدوای ناونیشانی ئەندامانی ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنیشدا بگەڕێ.

**١١- گازندەیەکی دیکە بنێرە:**

پەیامو گازندەیەکی دیکە بنێرە، بەچەشنێك زمانێکی توندتری هەبێت، بەڵام لەگەڵ هەبوونی سروشتێکی پیشەییانەدا. هەروەها یەکەم گازندەشی، لەگەڵدا هاوپێچ بکە.

**١٢- پێداگرو کۆڵنەدەر بە:**

جاروبار کارەکە، بەدواداچوونی زۆرترو یەك لەدوای یەکی پێویستە، تا وەڵامت دەستدەکەوێت، یاخود بە ڕێچارەیەك دەگەیتو ئەنجامێکی زۆرباشو دڵخوازت دەستدەکەوێت.

علاقات: ٥٨

# TOYOTA

# کۆمپانیای تۆیۆتا



**وەهاب حەسیب محەممەد**

سەرەتا پیشەسازی ئۆتۆمبێل لە وڵاتی ئەمریکادا بە جیهاندا بڵاوبووەوە، ساڵانێك ئەوان پێشەنگ بوون، بەڵام دواتر کۆمپانیای تۆیۆتا دەرکەوتو بوو بە یەکێك لە کێبەرکارە سەرسەختەکانی کۆمپانیا ئەمریکییەکان لە دروستکردنی ئۆتۆمبێلدا، لە ژیاندا هەموو سەرکەوتنێك، یان نشوستێك چیرۆکێك، یان کۆمەڵێك هۆکار لە پشتییەوەن، لەم نووسینەدا هەوڵدەدەین چیرۆکو هۆکارەکانی سەرکەوتنی کۆمپانیای تۆیۆتا باسبکەین، بە هیوای بەرچاوڕوونی خوێنەرانو کەڵك وەرگرتن لەو تاقیکردنەوە پڕبەهایە.

سەرەتا دروستکراوەکانی تۆیۆتا بە مەبەستی بەکارهێنانی نێو خۆیی بوو، تا ناوەڕاستی پەنجاکان کاتێك کۆمپانیای تۆیۆتا دەستیکرد بە هەناردەکردنی بەرهەمەکانی بە هەموو لایەکی دنیادا، دواتر گەیشتە ڕادەیەك بوو بە یەکەم کۆمپانیا لە جیهاندا بۆ فرۆشتنی ئۆتۆمبیل.

پرۆفایلی کۆمپانیای تۆیۆتا

جۆری کۆمپانیا/ گشتی

مێژووی درووستبوون/ ١٩٣٧

دامەزرێنەر/ کیشیرو تویودا

بنکەی سەرەکی/ ناغویا، تویوتا، بێیتشیو تۆکیۆ/ یابان

ژمارەی لقەکانی کۆمپانیای تۆیۆتا لە جیهاندا/ ٥٢٢

بەرهەمەکان/ ئۆتۆمبیل، بارهەڵگر، بەرهەمی پیشەسازی، تەکنەلۆژیای زیندوو (التقنية الحيوية)، ڕۆبۆت، خزمەتگوزاری دارایی.

داهات/ ٢٣٥،٨٩ملیار دۆلاری ئەمریکی ساڵی ٢٠١١

قازانج/١٣٦ ملیار دۆلاری ئەمریکی ٢٠١٠/٦/١٥

ژمارەی کارمەندان/ ٧١،١١٦ لە کۆمپانیای دایك ژمارەی کارمەندان دەگاتە ٣٢٠،٨٠٨ کارمەند.

چیرۆکی کۆمپانیای تۆیۆتا: ساڵی ١٨٩٠ (ساکیشی تۆیۆدا) یەکەم ئامێری چنینی لە دار دروستکرد، بە دەست کاری دەکرد، پاشان بە هۆی ئەو لێکۆڵینەوانەوە لەو بوارەدا کردی توانی هەنگاوێکی بنەڕەتیانە بچێتە پێش، ساڵی ١٩١٠ کاتێك ساکیشی ناچار بوو دەست لەکار بکێشێتەوەو گلەییەکی زۆری هاتە سەر لە ئەنجامی کورتهێنانی بودجەی کۆمپانیاکە، لە کۆتایی ساڵی ١٩١٠دا ساکیشی ناچاربوو گەشتێك بکات بۆ وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاو لە پێشکەوتنی پیشەسازی بە تایبەت لە بواری ئۆتۆمبێلدا هەڵوەستەیەك بکات، لەو ساتەوەختەوە ئۆتۆمبێل سەرنجی ڕاکێشاو بڵاوبوونەوەی لە یاباندا خەونێك بوو بۆ ساکیشی، بەڵام پیشەسازی چنین تا ساڵانێك دوای ئەوساش گرنگترین کارەکانی

ساکیشی بوو، پاش گەڕانەوەی وەرشەیەکی نوێی کردەوەو مکوڕ بوو لەسەر دۆزینەوەی ڕێگای نـوێ لە ڕێگای توێژینەوەکانییەوە، کاتێـك ئەو ئامانجی پێشخستنی بەرهەم بـوو لـە ڕێـگای توێژینەوەکانییـەوە بە هیوای پێشخستـنو فراوانکردنی کارەکانی لەم بوارەدا هانای بۆ (ئاشـیزۆ کوداما) برد کـە بەڕێوەبەری یەکێك لـە کۆمپانیاکان بوو، هـاوکات ناوبراو بـە هانایەوە هاتو دراوی پێویستی بۆ دابینکرد.

سـاڵی ١٩٢٠ (کیشـیرو تویودا) زانکۆی تـەواو کـردو پەیوەندی کرد بە بەشـی هونـەری لـە کۆمپانیاکـەدا، پـاش چوار سـاڵ توانی لە مەکینـەی ئامێری چنیندا پێشـکەوتنێك دابهێنێـتو داهێنانەکـەی جێگای ڕەزامەنـدی بێوێنـەو ڕێزلێنانی هەموو لایەك بوو، سـەرەڕای دوورینەوەی چەندیـن خـەڵات لەنـاوەوەو دەرەوەی یابانـدا، چونکە ئـەم داهێنانە بە ڕێژەی لە ٥٠٪ بڕی تێچوونی لە بواری پیشەسازی چنینـدا کەمکـردەوەو خاوەنەکەی بوو بە کەسـێکی کارا کە لە بەرەو پێشبردنی پیشەسازی یابانیدا ڕۆڵی بەرچاوە.

سـاڵی ١٩٢٦ کۆمپانیای تۆیودا بۆچنین بە ئامێری دامەزراند، باوکی کیشیرو بڕی ١٠٠ هەزار پاوەندی ئیستەرلینی دەستکەوت کاتێك مافـی داهێنانەکەیان فرۆشـت بە کۆمپانیایەکـی بەریتانـی ناسـراو، ئـەو ساڵی١٩٣٠ کاتێك باوکی کیشیرو (ساکیشی) کۆچی دواییکرد، هەمیشە ئەو ئامۆژگارییەی لە یادەوەریدا بوو کە دەیگوت: بەشـداری مـن لە داهاتووی یاباندا لە بواری چنیندا بـوو، دەمەوێت بەشـداری تۆ لـە بواری ئۆتۆمبێلدا بێت.

خەونـی کیشـیرو بریتـی بـوو لـە دروسـتکردنی ئۆتۆمبێلێـك کـە خاوەندارێتییەکـەی بگەڕێتـەوە بـۆ خانەوادەکـەی، گرنگترین ئامانجی بریتی بـوو لە دروسـتکردنی ئۆتۆمبێلێك کە لە هەمان کاتدا باشو ئابووریانەو نرخیشـی گونجاو بێت.

لە سـاڵی ١٩٣٣ دا کیشیرو لە بەشێکی کارگەی چنیندا دەستیکرد بە لێکۆڵینەوە لـە مەکینـەی بانزینو سـاڵی ١٩٣٤یەکەم مەکینەی لە جۆری A دروسـتکردو ساڵی ١٩٣٦ یەکەم سـەیارەی کرێی دروسـتکرد، لـە جۆری AA بە هـۆی ئەوەی بنەمای بیرۆکەی ئەم ئۆتۆمبێلانە ئەمریکی بوون لە یەکچوونێکی زۆر لە نێوان AA و دۆجو شۆفرلێتدا هەبوو، لە هەمان ساڵدا لە نێوان ٢٧٠٠٠ دروشـمدا کۆمپانیا بۆ هەڵبژاردنی نیشـانەیەکی تازە بۆ کۆمپانیا ڕێکخسـت، ئەو نیشـانەی ئێستا پەسەند کرا لە ساڵی ١٩٣٧ کیشـیرو کۆمپانیایەکی سـەربەخۆی دامەزراندو ناوی کۆمپانیاکەی لە تۆیوداوە گۆڕی بۆ تۆیۆتا، وەك جیاکردنەوەیەك لە نێوان کارەکانی بـاوکو کوڕدا. کۆمپانیای تۆیۆتا بۆ دروستکردنی ئۆتۆمبێل هەلگری نـاوی کۆمپانیاکە بوو تا سـاڵی ٢٠٠٨، لەو مێـژووەوە نـاوی کۆمپانیاکـە گـۆڕا بە (کۆمپانیای تۆیۆتا)

سـاڵی ١٩٤٠ G1 یەکەم بارهەڵگر بوو کۆمپانیای تۆیۆتا دروستیکردو دواتر چەند جۆرێکی لەبەرگیرایەوە، وەك KC، KB، KCY لە میانەی جەنگی جیهانی دووەمدا کۆمپانیای تۆیۆتا کارەکانی تەرخانکرد لە دروستکردنی بارهەڵگردا، بۆ سوپای یابانی بە هۆی کورتی بودجەوە لە کاتی جەنگدا بارهەڵگرەکان بە سادەترین شێوە بەرهەم دەهێنران. دوای جەنگ بە دیاریکراوی لە سـاڵی ١٩٤٧کۆمپانیای تۆیۆتا دەستیکرد بە بەرهەمهێنانـی ئۆتۆمبێلی گواسـتنەوەی گەشـتیاران بـە SA ناسـێندرا بە بازاڕو دواتر بە گروپی S ناوی دەرکرد.

سـاڵی ١٩٥٠ (دەیەیـی پەنجـاکان): سـاڵی ١٩٥٠ (کۆمپانیـای تۆیۆتـای بـۆ بازرگانیکردنـی ئۆتۆمبیـل)ی دامەزراند تا سـاڵی ١٩٨٢ بەردەوام بوو، لەو ساڵە بە دواوە ئۆتۆمبێلـی لاندکـروزەری (دفعی روباعـی ٤×٤) دامەزرانـد، تـا ئەمـڕو بەرهەمهێنانـی بەردەوامە بە پێشـەنگی ئەو ئۆتۆمبێلانە دادەنرێت کە کۆمپانیای تۆیۆتا دروستیکردووە گەرچی ڕیزبەندی تۆیۆتـا (ئەو ئۆتۆمبێلانـەی لە ژێر ناوی تۆیۆتادا دروسـتدەکرێن) لە سـاڵی ١٩٥٦دا (تۆیۆتـا کـراون) یەکـەم ئۆتۆمبێل بوو ڕەوانـەی بازاڕەکانی ئەمریکاکراو بەشـی ئۆتۆمبێلـی کراونی تیادا کرایەوەو سـاڵی ١٩٥٨ کراوان گەیشتە وڵاتی بەرازیل.

دەیـەی سـاڵانی ١٩٦٠: لـەم دەیەیەدا تۆیۆتـا دەسـتیکرد بـە لێکۆڵینـەوەو فراوانخوازییەکی زۆر، هاوکات باڵەخانەی (تۆیۆتا بۆ لێکۆڵینەوەو گەشەپێدان) تەواو بوو، هەروەها کۆمپانیا بەردەوام بوو لەسەر بەرهەمهێنانی بەرهەمەکانیو سـاڵی ١٩٦٣ بەشێکی کۆمپانیاکە لە ملبۆرن/ ئوستراليا کرایەوە، لەم سـاڵەدا بابلیکای بڵاوکردەوە کە پاشـتر بە کورولا ناسرا، ساڵی ١٩٦٥ بە هاوکاری هـەردوو کۆمپانیای (داهیتسـۆ، هینـۆ) دەسـتیکرد بـە دروسـتکردنی ئۆتۆمبێلی کورولاو هەمان سـاڵ GT٢٠٠٠ کە ئۆتۆمبێلێکی وەرزشی بوو بڵاوکردەوە لەو کاتەدا ئۆتۆمبێلی ئەمریکی لە بازاڕدا باڵادەست بوو، بەڵام ساڵی ١٩٧٠ کۆمپانیای تۆیۆتا لە بەرهەمهێنانی GT٢٠٠٠ وەستا چونکە تەنها فرۆشی ٣٣٧ ئۆتۆمبێل بوو.

دەیـەی سـاڵانی ١٩٧٠: لـەم سـاڵەدا کۆمپانیـای تۆیۆتـا نـەوەی یەکەمـی سـیلیکای بەرهەمهێنـا، کـە درێژکراوەی GT ٢٠٠٠ بـوو، پـاش دووسـاڵ فرۆشـی تۆیۆتـا بەرزبوونەوەیەکـی بەرچـاوی بەخۆیـەوە بینیو سـاڵی ١٩٧٣ ئۆتۆمبێلی جـۆری کرسـیدای خێزانـی بەرهەمهێنا، سەرکەوتنێکی بەرچاوی بە خۆیەوە بینی بەتایبەت لە وڵاتانی کەنداو، هەمان سـاڵ کۆمپانیاکە بەشی کۆمپانیای لە ویلایەتی کالیفورنیا بۆ لێکۆڵینەوە لە نەخشەکێشان بە نـاوی ( کالیفۆرنیا تۆیۆتا) دامەزراندو سـاڵی ١٩٧٥ سـەرۆکایەتی کۆمپانیاکە درا بە (سیسیتشـی کاتو)و سـاڵی ١٩٧٩ لقێکی کۆمپانیاکـە لە وڵاتی میسر کرایەوە، لە بـارەی جۆرەکانی ئۆتۆمبێلـی کۆمپانیای ناوبراو لە بازاڕەکانی میسـردا بریتی بوو لە لاندکروز، کورۆلا، هەمان ساڵ دەستکرا بە بەرهەمهێنانی ئۆتۆمبێلی سوبرا تاساڵی ١٩٨٨ بەردەوام بوو پاشـان سـاڵی ٢٠٠٢ لە یابان بۆ یەکجاریی بەرهەمهێنانی ڕاگیرا.

دەیەیـی سـاڵانی ١٩٨٠: سـاڵی ١٩٨٠ کۆمپانیـای تۆیۆتـا یەکـەم (ناوەنـدی خزمەتگـوزاری لـە پایتەختـی چیـن کـردەوە) لـە کۆتایی هەمان سـاڵدا کۆی بەرهەمـی کۆمپانیاکـە گەیشـتە ٣ملیۆن یەکـە، سـاڵی ١٩٨٢ یەکەم جـۆری کامری دروسـتکرد، بیرۆکەکـەی لـە ئۆتۆمبێلی سـیلیکا وەرگیرابوو، هەمان ساڵ هەردوو کۆمپانیای (تۆیۆتا بۆ بازرگانی ئۆتۆمبێل) لەگەڵ (تۆیۆتا بۆ ئۆتۆمبێل)، سـاڵی ١٩٨٤ نـەوەی یەکەمـی MR٢ی بەرهەمهێنـا کـە ئۆتۆمبێلێکی وەرزشـی بوو لە سـاڵی ٢٠٠٧دا بەرهەمهێنانی ڕاگیرا. هەمان سـاڵ کۆمپانیای تۆیۆتا هەسـتا بە دامەزراندنی (NUMMI)ی دامەزراند کە کۆمپانیایەکی یەکگرتوو بوو لەگەڵ کۆمپانیای جەنەراڵ مۆتۆرز کە سـاڵانێك بوو داخرابوو، ساڵی ١٩٨٦کۆمپانیـای تۆیۆتـا لـە هەریەك لە کەنـەداو ئەمریـکا کۆمپانیـای تایبەتی ئۆتۆمبێلی دامەزراندو سـاڵی ١٩٨٩بەشێکی نوێـی دامەزرانـدو دەسـتیکرد بـە بەرهەمهێنانی ئۆتۆمبێلی گرانبەهاو دواتر بە ئۆتۆمبێلی (لگزس) شۆرەتی پەیداکرد.

**دەیەی ساڵانی ١٩٩٠:** LS٤٠٠ بە یەکەم جۆری ئۆتۆمبێلی لگزس دادەنرێت کە ساڵی ١٩٨٩ بەرهەمهێنرا. ساڵی ١٩٩٢ کۆمپانیای تۆیۆتا لە بەریتانیا دەستیکرد بە بەرهەمهێنان ساڵی ١٩٩٥ (تاتسورو تویودا) جێگای( هیرۆشی ئوکودا) لە بەڕێوەبەرێتی کۆمپانیاکەدا گرتەوە. ساڵی ١٩٩٧ کۆمپانیای تۆیۆتا ڕوویکردە بەرهەمهێنانی ئۆتۆمبێل لە جۆری هاوڕێی ژینگەو یەکەم سەیارەی (هجین) تێکەڵی دوورەگی بەرهەمهێنا ئەوەش (تۆیۆتا بریۆس) بوو کە خاوەنی دوو بزوێنەر بوو، یەکێکیان بە بانزین ئەویتریان بە کارەبا کاری دەکردو برەوێکی باشی هەبوو تا ئەمڕوش بەرهەمدەهێنرێت، لە ساڵی ١٩٩٨ لە بەندەری تیانجین لە چین کۆمپانیای تۆیۆتا دەستیکرد بە بەرهەمهێنانی ئۆتۆمبێلو ساڵی ١٩٩٩ (ئیکو)ی بچوکی بەرهەمهێناو هەمان ساڵ هیرۆشی ئوکودا سەرۆکایەتی دەستەی کارگێری گرتە ئەستۆ.

**دەیەیی ساڵانی ٢٠٠٠:** لەم دەیەیەدا کۆمپانیای تۆیۆتا دەستیکرد بە بەرهەمهێنانی ئۆتۆمبێل لە فەرەنسادا، هاوکات چەند لقێکی نوێی لە کالیفۆرنیاکردەوە، لە ساڵی ٢٠٠٣ کۆمپانیای تۆیۆتا لە هەریەك لە ولایەتی (ئەلاباما، تەکساس) بنیاتنا. ساڵی ٢٠٠٥ کۆمپانیای تۆیۆتا دەستیکرد بە بەرهەمهێنانی ئۆتۆمبێلی (ئیجو)، هاوکات جۆری بیجۆ ١٠٧ و ستروین سی١ وەك هاوکارییەك لە نێوان کۆمپانیای تۆیۆتاو کۆمپانیای بیجۆ لە کۆماری چیكو هەمان ساڵ کۆمپانیای تۆیۆتا لە ڕووسیا دەستی بە بەرهەمهێنانی ئۆتۆمبێل کرد. هاوکات دەستیکرد بە بەرهەمهێنانی ئۆتۆمبێلی لگزس لە ناوخۆی یاباندا، تا ئەوکاتە دروستکردنی تایبەت بوو بە دەرەوەی یابان. لە ساڵی ٢٠٠٧کۆمپانیای تۆیۆتا بوو بە پێشەنگی کۆمپانیاکانی جیهان لە فرۆشتنی ئۆتۆمبێلدا تا ئەو کات کۆمپانیای جەنەڕاڵ مۆتۆرز ئەو جێگایەیی قۆرخکردبوو. لە ساڵی ٢٠٠٨ کۆمپانیای تۆیۆتا یادی پەنجا ساڵەی دامەزراندنی کردەوە، ساڵی ٢٠٠٩ کۆمپانیای تۆیۆتا جاری زەرەری خۆیداو ئەو کات گەیشتە ٤،٢ ملیار دۆلاری ئەمریکی. لە نۆفەمبەری ٢٠٠٩ تا چارەکی یەکەمی ٢٠١٠ کۆمپانیای تۆیۆتا ٨ ملیۆن ئۆتۆمبێلی لە سەرتاسەری جیهاندا کێشایەوە، بەڵکو وێنەی خۆیی پاکبکاتەوە لە بەرچاوی بەکاربەرەکانی.

لەم مێژووەوە دەتوانین تێفکرین ئەو فەلسەفەو هۆکارانە دیاریبکەین کە کۆمپانیای تۆیۆتا کاری لەسەر کردووەو یان بەردەوامە لەسەری. فەلسەفەی تۆیۆتا لەسەرچوار کۆڵەکە بنیاتنراوە کە بنەماکەی لە خودی کۆمپانیاکەوە وەرگیراوە بریتین لە:

١- بیرکردنەوە بە تێڕوانینێکی دوور مەودا، وەك بنەمایەك لە دەرکردنی بڕیاردا.

٢- بەکارهێنانی شێوازی کرداری لە چارەسەرکردنی کێشەکاندا.

٣- گەشەکردن بە ڕێکخراوەکە لە ڕێگای پێگەیاندنو گەشەکردنی کارمەندانییەوە.

٤- پەیبردن بە بەردەوامی لە چارەسەری کێشەکان لە بناغەدا پاڵ بەڕێکخراوەکەوە دەنێت بۆ فێربوون.

پلانی کۆمپانیای تۆیۆتا لە بەرهەمهێنانی ئۆتۆمبێلدا بریتییە لە:

١- داڕشتنی بڕیارەکانی کارگێری لەسەر فەلسەفەی دوور مەودا تەنانەت ئەگەر لەسەر حسابی پلانەکانی کورت ماوەش بێت.

٢- کۆمپانیای تۆیۆتا سیستەمی کێشانەوەی بەرهەمەکانی بەکاردەهێنێت بە مەبەستی دوورکەوتنەوە لە زیادەی خواست.

٣- کاری پێوانەیی سەرچاوەی پاڵپشتو پێشخستنی کرێکارە.

٤- ئامادەکرنی ئەو ڕێبەرانەی کە بە تەواوی لە کاردەگەنو لە فەلسەفەی کار گەیشتونو کەسانی تر فێر دەکەن.

٥- بۆ خۆت بڕۆو تەماشابکە تا بە تەواوی لە بارودۆخەکە تێدەگەیت (وتەی جینشی جینبوتسو).

٦- دەرکردنی بڕیار بە کۆڕاو لەسەرخۆیی، کاتێك هەموو بڕیارەکان بەهەند وەردەگریت بەپەلە بڕیاری خۆت بدە.

٧- پێشخستنی کەسە تایبەتمەندەکانو جیاوازی لە نێوان ئەوانەی بە وردی شوێن پلانی کۆمپانیاکە دەکەون.

٨- بەرچەکرداری توندو پێشخستنی بەردەوام وادەکات ڕێکخراوەکە ببێت بە ڕێکخراوێکی فێرکاری.

٩- هەڵسەنگاندنی پاڵەپەستۆی کار.

١٠- بەکارهێنانی دادوەرییەکی بینراوانە کە دەبێتە هۆی شاردنەوەی کێشە شاراوەکان (پەنهانەکان).

١١- ڕێزی تۆڕی هاوکارانت بگرە لە دابینکەرانو هاوبەشەکانت بە دیاریکردنیانو یارمەتیدانیان لە پێشختن.

١٢- دروستکردنی کەشێکی وەستاو بۆ چارەسەرکردنی ئاریشەکان، بە هیوای بەدەستهێنانی باشترین ئەنجام لە کاتی بەردەوامبووندا.





لە ئینگلیزییەوە: کاروان ئەحمەد

# ١٠ هەنگاو بۆ بەدەستهێنانی بەختەوەری!

خۆشبەختی بریتی نییە لەوەی کە لە هەموو بەربەستێکی ژیان دووربین، چونکە هەموو کەسێك کەم، یان زۆر، تووشی ئاستەنگو نارەحەتی دەبێت لە ژیاندا. مەبەستی ئێمە لێرەدا ئەوەیە کە تۆ چۆن بتوانیت بە شێوەیەکی گونجاو کاردانەوەت هەبێت بەرامبەر بارودۆخەکانی ژیان، بێگوێدانە ئەوەی کە ئایا باشن، یان خراپ. گومانی تێدا نییە کە ئێمە هەموومان دەمانەوێت دڵخۆشو بەختەوەر بین، بەڵام هەر یەکێکمان ڕێگای جیاوازمان هەیە بۆ بەدەستهێنانی، لەم بابەتەدا باس لە (١٠) هەنگاو دەکەین، بۆ گەیشتن بە خۆشبەختی:

١- هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەو کەسانەدا بکە کە زیاتر بزە دەخەنە سەر لێوانت: لێکۆڵینەوەکان دەریانخستووە کە ئێمە لەوپەڕی دڵخۆشیداین کاتێك لەگەڵ کەسانێکداین، کە ئەوانیش وەکو ئێمە دڵیانخۆشە. ئەمەش بەو مانایە نایەت کە دەبێت کەسانی تر فەرامۆش بکەین، چونکە هەموومان تەواوکەری یەکترین لەم ژیانەدا.

٢- بەها گرنگەکانی ژیانت لە ئامێز بگرە: هەر شتێك بدۆزیتەوەو بیزانیت ئەوا ڕاستە، باوەڕ بە هەر شتێك بکەیت ئەوا دڵنیابە، بەهاو نرخی خۆی هەیە، بە تێپەڕبوونی کات، هەتا زیاتر شانازییان پێوە بکەیت، ئەوا باشتر هەست بە بوونی خۆت دەکەیت، هەروەها بەو کەسانەش کە خۆشت دەوێن.

٣- بە باش ڕازی بە، هەروەها بیر لە باشترین بکەرەوە: لە ژیانت وردبەرەوە، ئەو شتانە پاشەکەوت بکە کە بۆ هەنگاونانت بەرەوخۆشبەختی گونجاوە. دەستبەرداری شتێك مەبە هەرلەبەرئەوەی نمونەیی نییە. کاتێك شتە باشەکان ڕوودەدەن تەنانەت بچوکترینیان، ئەوا بە دڵخۆشییەوە پێشوازیان لێبکە. مەترسە لەسەیرکردنی ئەو شتانەی کە دەتەوێت، وابیهێنە پێش چاوت کە بەدەستت هێناون. زۆرکەس لەم پرۆسەیە دووردەکەونەوە، چونکە بێ ئومێد دەبن، ئەگەر سەرکەوتوو نەبن، بەڵام لە ڕاستیدا هێنانە پێش چاوی ئەو شتانەی کە دەتەوێت یەکێکە لە هەنگاوەکانی بەدەستهێنانی.

٤- گەشبین بە، سەرکەوتن بە دەست بێنە، دڵخۆش بە: هەندێك لە دەروونناسان پێیان وایە کە خۆشبەختی دەستکەوتێکی گەورەی گەشبینییە، چونکە کەسی گەشبین حەزی لە سەرکەوتنە، سەرکەوتنیش هاوکاتە لەگەڵ خۆشبەختی. کەواتە گەشبین بە لە ژیانتدا، بۆئەوەی سەرکەوتنو خۆشبەختی بەدەستبهێنیت.

٥- هەستەکانت هاوبەشی پێ بکە لەگەڵ خێزانەکەتو هاوڕێ خۆشەویستو کەسە نزیکەکانتدا: هەرکاتێك تۆ هەستەکانت، یان کێشەکانت، لەگەڵ خۆشەویستەکانتدا باسکرد، ئەوا هیچ شتێك بەبێ چارەسەر نامێنێتەوە بۆت. لێکۆڵینەوەکان سەلماندوویانە ئەو کەسانەی کە کێشەکانیان بۆ کەسانی دی باس دەکەن، ئەوا زیاتر دڵخۆش دەبن لەو کەسانەی کە باسی ناکەن. کەواتە تۆش هەمیشە هەندێك لە هەستەکانت باس بکە بۆ ئارامی بەخشین بە دڵو دەروونت.

٦- ئامانجێك دیاری بکە لە ژیانتدا: ئەو کەسانەی باوەڕیان وایە کە ڕۆڵێکی باشیان هەیە لە کۆمەڵگادا، ئەوا هەستێکی باشیان دەبێت لەبارەی ژیانیانەوە. زۆر کەس هەمیشە دەیانەوێت بەشێك بن لە شتێکی مەزنتر، چونکە تەنها کەمێك هەوڵو تێکۆشانی دەوێت. پێویستە پێش هەموو

شـــتێك ئامانجەكەت دیاری بكەیت، بە پێی ئەو مەبەستە بەرنامەكانت دابڕێژیت.

٧- كراوەبــە بــۆ گۆڕانــكاری: هەتــا ئەگەر وا هەست بكەیت كە باش نیە، ئەوا گۆڕانكاری شتێكە كە دەتوانێت یارمەتیت بدات. گریمانـــەی ڕووداوی لە ناكاو بكەو بەشێوەیەكی گونجاو پلانو بەرنامەی بۆ دابنێ. گۆڕانی ئەو شـــێوازەی كە خۆمانی تێدا دەبینین، یان هاوبەشـــەكانمان هەتا كێشەكانیشـــمان، ئـــەوا بە مانـــای گۆڕان دێت لە ژیانمانـــدا. كەواتە تۆش بیرۆكە خراپەكانت بگۆڕە بە بیرۆكەی باش، ڕەت كردنەوە بگۆڕە بە ڕازیبوون، مەنگی، یان وەســـتان بگۆڕە بە گەشەكردن، توڕەبوون بگۆڕە بە هێمنیو لەسەرخۆیی.

٨- فشاری زیادە لەسەر خۆت لابەرە: چونكە گوزەرانـــت ناخۆش دەكاتو ڕێگر دەبێت لەوەی كە خۆشی لە ژیان ببینیت. هەروەهـــا كاریگەری نەرێنـــی ماوە درێژ لەســـەرت درووســـت دەكات. بـــۆ نموونە زۆرجـــار ڕقت لـــە كارێكەو ناشـــتوانیت بیگۆڕیـــت، ئـــەوا دەبێت بە شـــێوەیەكی جیـــاواز چارەســـەری بكەیـــت. بڕیارێكی پێش وەخت بدە، بزانە كاردانەوەت چۆن دەبێت بەرامبەر كێشەكانی داهاتووت.

٩- پەیوەندیـــت لەگـــەڵ كەســـە نزیكەكانتـــدا بەهێزتـــر بكە: هەمیشـــە شـــایەنی ئەوەیـــە كـــە كار بكەیـــت بـــۆ گەشـــەپێدانی پەیوەندیت لەگەڵ هاوڕێو كەســـەكانتدا، چونكە هەتا زیاتر خاوەنی ئەو پەیوەندییـــە بیت، ئەوا زیاتر ژیانت دروســـت دەكەیت. هەموو سكاڵا چارەسەر نەكراوەكان نیشانە بكە، پۆزش بهێنەرەوە بۆ ئەو شـــتانەی كە لەوانەیە پەشـــیمان بیت بۆیان. ئەمە دەتوانێت جیاوازییەكی گەورە دروســـت بكات لە تەندروســـتیتدا، لـــە ئاســـتی فشـــارەكانتدا، هەروەهـــا لە خۆشبەختیتدا.

١٠- ئاهەنـــگ بـــۆ ســـەركەوتنەكانت بگێـــڕە: زۆربەی خەڵك مێشـــكی خۆیان تەنها بەو شتانەوە داگیر دەكەن كە تیایدا سەركەوتوو نەبوون، لە جیاتی ئەوەی كە خۆشیو شادی بگێڕن بۆ ئەوانەی كە تیایدا ســـەركەتوو بوون. ئارام بگرە لەسەر ئەو شـــتانەی كە بەشـــێوەیەكی باش بەدەست نەهاتوون بۆت. بە یارمەتی خوای گەورەو بە جێبەجێكردنی ئەم هەنگاوانە دەبیتە كەسێكی هێمنو لەسەرخۆو خۆشبەخت.



# گوڵت دەوێت، بەبێ دڕك؟!

ڕەمەزان عبدالله

لەم ڕۆژگارەدا كەســـانێك هەن، گوڵیان دەوێت بەبێ دڕك! هاوڕێیان دەوێت بەبێ هەڵە! ژیانیان دەوێ بەبێ ناخۆشی!

جا ئایا دەبێت شتێكی واهەبێت؟ گەر هەشبێت ئایا تامو سوودی هەیە؟

وەڵامەكـــەی زۆر ئاســـانو ڕوونـــە، بێگومـــان نەخێر، چونكە هەموو شـــتێك بە پێچەوانەكەیەوە جوانە، ئەوەی گرنگە ئێمە لە كاتی هەڵبژاردنی گوڵەكە دڕكەكان فەرامـــۆش نەكەیـــن، نـــرخ بـــۆ دڕكەكان دابنێیـــن، بیرو خەیاڵمان لەســـەر لایەنی جوانییەكانی قوڵ بكەینەوە!

تـــا لە كاتـــی چوونـــە ژوورەوەی دڕك لە ناو پەنجەكانمان هەســـتی پێ نەكەین، لەبەر لایانە جوانەكانی گوڵەكە!

هەڵبژاردنـــی هاوڕێیەتـــی شـــتێكی پێویستە، بەڵام با بیرمان نەچێت لە كاتی هەڵەیەكی تەنها ئەو خاڵە ڕەشە نەبینین لـــەم هاوڕێیەمـــان، چونكە هـــەزارن كاری باشـــمان لـــێ بینیوە، بە جارێـــك كەڕەتی سفری نەكەین، با لەم ژیانەدا نموونەمان وەكـــو نموونەی مەجنوون بێت بۆ شـــتە باشەكان، (دەگێڕنەوە كەوا ڕۆژێك مەجنون بـــە بـــەردەم بەرماڵی پیاوێكی خواناســـدا تێپەڕی، پیاوەكەش نوێژەكەی بڕیو وتی: هێی پیـــاو، من لە كاتـــی ڕازونیازدا بووم لەگـــەڵ خودا، تـــۆ بۆ ئـــەم پەیوەندییەت پچڕانـــد؟ مەجنون زەردەخەنەیەكی كردو وتی: من عاشقی بەندەیەكمو تۆم نەبینی! ئـــەی تۆ چۆن عاشـــقی خودایـــتو كەچی منت بینی؟!)

بەڵـــێ گـــەر لـــەم ژیانە وەهـــا ڕەفتار بكەین لەگەڵ خوای گـــەورەو بەندەكانی، هەرگیـــز هیچ دڕكێك ســـاردمان ناكاتەوە لـــە هەڵبژاردنی گوڵێك! بیرمان تەنها لەو لایانـــە دەبێت كـــە باشو جوانە، ڕاســـتە كە وتوویانە (ئـــەوەی هەڵە نەكات مرۆڤ نییە)، كەواتە بـــا هەڵەی یەكترمان قبوڵ بێـــت لە پێنـــاوی باشـــتركردنی یەك، لە كاتـــە ناخۆشـــەكان بیرمـــان تەنها لە لای خۆشـــییەكان چڕبكەینـــەوە تا لـــەم كاتە ناخۆشە ڕزگارمان بێت.

كێشە ئەوە نییە كە جوانی لەم دونیایە بوونی نییە، كێشـــە لەوەدایە كە ئێمە بە دەگمەن جوانییەكان دەبینین!

بیریشـــمان نەچێـــت وەكـــو (ئەنتۆنی ڕابێنز) دەڵێت: لەشـــەڕ خراپتریش هەیە! ئەو كەســـەیە كەوا هیچی نییە شـــەڕی بۆ بكات!

ژیان بەبێ ناخۆشـــی تامـــی نییە، چۆن خواردن لە كاتی تێریدا تامێكی وەهای نییە، بگـــرە تەنانـــەت جاری وا هەیـــە لە جیاتی ئەوەی سوودی لێوەربگرین، دەبێتە زیان!

من ناڵێم با بە ناخۆشـــی بژین، بەڵكو دەڵێـــم گەر ناخۆشـــییەك ڕووی تێكردین با پشـــت بەخوا ببەســـتینو فەرامۆشـــیان نەكەین، گەر بڕیار وابوایە دەرگاداخراوەكان نەكرابایەوە، ئـــەوە لە جیاتی دەرگاكە بە دیوار دەیانگرت!

بۆیە گەر دەستت بۆ گوڵێك برد، بیرت نەچێـــت دڕكی لەگەڵدایە، بەڵام ئەم دڕكە بۆ جوانی گوڵەكەیە، نەك ناشیرینكردنی!

بەشی دووەم

و: بۆ کوردی: پشتیوان موبارەك

# حەوت ڕەفتار کە زۆرترین کاریگەرییان لەسەر خەڵك هەیە




پوختەکردنو وەرگێڕانی بۆ عەرەبی:- د. احمد الشازلی

## ڕەفتاری دووەم: لە کۆتاییەوە دەست پێبکە (إبدا بالنهاية)

شێوازێکی جوانە، وا سەیری ئامانجو خەونەکانمان بکەین وەك ئەوەی هێنابێتمانە دی، کاتێك لە خەیاڵی خۆماندا بە کۆتایی دەستمان پێکرد، کاتێك کەوا خەیاڵ دەکەین گەیشووینەتە ئەو لوتکەیەی دەمانەوێت، کاتێك دەزانین ئێمە ئێستا لە کوێین، بۆ کوێ دەڕۆین؟!! واتە ئێمە ئاڕاستەیەك دادەنێین بۆ هەموو وزەکانمان، بۆ هەموو هێزو تواناکانمان، بە ئاڕاستەیەکی هەڵەدا ناڕۆین، کاتو هەوڵێکی زۆرمان لێ بە فیڕۆناڕوات.

ئەم شێوازە ئامانجی گۆڕانی ڕێگای بیرکردنەوەیە، لەبەرئەوەی بە گۆڕانی ڕێگای بیرکردنەوە هەموو کەسێك دەتوانێت ژیانی بگۆڕێت، لەسەرەتاوە بیرۆکەیەك دێت، پاشان ڕێکخستنی ئەم بیرۆکەیە دێت، لە شێوەی چەندین نەخشەو بیرۆکەی نوێدا بۆ جێبەجێکردنی، پاشان گۆڕینی ئەم نەخشانە بۆ ڕاستی لە سەر زەمینی واقیعدا، پێویستە بزانیت سەرەتا کە هەمووی تەنها بیرۆکەیەك بوو، هەمووی لەخەیاڵتدا بوو!! وەك دەوترێت: "ئاگات لە بیرۆکەکانت بێت، چونکە دەبێتە وشە، هەروەها ئاگات لە وشەکانت بێت، چونکە دەبێتە کردەوە، ئاگات لە کردەوەکانت بێت، چونکە دەبێتە (ڕەفتار)، ئاگات لە ڕەفتارەکانت بێت، چونکە دەبێتە بنەما، ئاگات لە بنەماکانت بێت، چونکە دواڕۆژت دیاری دەکات"!

"بە خەیاڵکردن دەتوانین بڕۆینە ئەو جیهانانەی کە پێشتر تێینەچووین، بەڵام بەبێ خەیاڵکردن ناڕۆینە هیچ جێگایەك وێنایەکی تەواو بۆ ڕۆژەکەت دابنێ لە بەرەبەیانەوە، بە خەیاڵ بیربکەرەوە چی دەبێت؟! چی ڕوودەدات؟! چی دەکەیت؟! مێشکت ڕابێنە لەسەرکێشەکان، پێویستە خۆت ببینیت کە چارەسەریان دەکەیت.

هەموو شتەکان دووجار ڕوودەدەن:

* جاری یەکەم: لە ژێریتدا (خەیاڵکردنەوەت بۆی)

*جاری دووەم: لە واقیعدا (ڕاستی)

یان بە مانایەکی تر کاتێك کە کێشەیەك ڕووبەڕووت دەبێتەوە دەتوانیت دووجار چارەسەری بکەیت، جارێکیان لە مێشکتدا کاتێك کە بیری لێدەکەیتەوە، جارێکی تر کە لە سەر زەمینی واقیع ڕووبەڕووت دەبێتەوەو هەوڵ دەدەیت چارەسەری بکەیت، (پێشتر ئەم کێشەیەت دیوە..)

سێ شێوە هەیە لە ژیاندا بۆ بەڕێوەبردنی کارەکانمان:

١- ئەو کارە چییە کە دەمەوێت جێبەجێی بکەم؟

٢- چۆن دەتوانم ئەم کارە بە باشترین شێوە تەواو بکەم؟

٣- کارەکە جێبەجێ بکە، (بەرهەمی کار).

"کۆتایی ڕۆژەکەت لە ژێریتدا دابنێ، سیناریۆیەك، یان فەلسەفەیەك بۆ ژیانت دابنێ، لەبەرئەوە ئەمە وات لێدەکات بیرۆکەکانت لەسەر ئەوە جێگیر بکەیت کە دەتەوێت چۆن بیت، (ئەو کەسێتییەی کە دەتەوێت)، دەتەوێت چی بکەیت ؟)، (دەتەوێت چ ئامانجێك بێنیتە دی)، یان بە مانایەکی تر یەکەمجار پێویستە بزانیت چی لە ناختدا دەسوڕێتەوە، ئەو کەسەی کە لە ناختدایە چۆن دەدوێت، (من دەمەوێت ببمە.......)، (دەمەوێت ببمە خاوەنی.......)، (دەمەوێت.......)، چیت لە ژیانت دەوێت ؟ (چی پاڵت پێوە دەنێت بۆ جێبەجێکردنی .......) هەروەها چۆن دەتەوێت ئەو کارە بهێنیتە دی؟

پێش ئەوەی سیناریۆ بۆ ژیانت دانێیت، سەرەتا پێویستە بزانیت سەرچاوەی ژیانی تۆ چییە، (ئەو بنەمایانەی کە ژیانی تۆی لە سەر دەڕوات)، چونکە ئەو بنەمایانەی کە تۆ دایدەنێیت، سەرچاوەی هەموو ئەو کارو کردەوانەیە کە دوای ئەوە دێن،

یان بە مانایەکی تر پێویستە ژیانت لەسەر بنەماگەلێکی بەهێزو کۆمەڵێك یاسای ڕاستو دروست بنیاد بنێیت، کاتێك ئەمە دەکەیت تێڕوانینت ڕوونو ئاشکرا دەبێت، هەروەها هەڵسوکەوتو پەیوەندییەکانت، هەموو شتێك کە جێبەجێی دەکەیت چاك دەبێت.

هەروەك ڕەفتاری یەکەم دەڵێت: "تۆ دادوەریت لە ژیانتدا"، ڕەفتاری دووەمیش دەڵێت: "بەرنامەی ژیانت بنووسە، ئەو سیناریۆیە بنووسە کە دەتەوێت ژیانتی لە سەربڕوات".

هەموو وزەو تواناکانت بەکار بهێنە، بۆ زانینی ئەوەی کە لە ناختدا خول دەخوات، چی دەسەڵاتی هەیە بەسەرتدا، چیت دەوێت لە ژیان، چۆن شوێنەوارت لە ژیانتدا بەجێدەهێڵیت؟؟

من فەلسەفەم لە ژیاندا ئەمەیە: "تۆ لێپرسراویت لە ژیانت، بەڵام ئەگەر کاری باش بکەیت لەم ساتانەدا، ئەوا لە ساتەکانی داهاتوودا لە باشترین شوێندا داتدەنێت".

# چاکی مەکە، با خراپ نەبێت!



وشیار عەلی- پێنجوێن

هاوینی پار بوو، برادەرێکم لە شارۆچکەی (سەیدسادق)ەوە سەر لە بەیانییەك بەرەو پێنجوێن بەڕێکەوت بە مەبەستی چاککردنەوەی ناڕێکیو فوپاوییەکی کەم کە لە ئوتومبێلەکەیدا بوو، هاتنو دەرچوونی لە سەیدسادقەوە تا گوندی (کەولۆس) کە چەند خولەکێك لەوێوە دوورە بێ کێشە بوو، بەڵام لەو نزیکانە بە هەر هۆیەك بوو تایەی ئۆتۆمبێلەکەی بەر ڕەگلەیەك دەکەوێت، فەرمان لە دەستی لێخوڕدا نامێنێو دەدا بە گردۆلکەیەکدا، سوپاس بۆ خوا خۆی بە بێ زیان دەرچوو، بەڵام ئۆتۆمبێلەکەی پاش ئەوەی بە هەر جۆر بوو گەیاندییە پێنجوێنو بردییە لای وەستای تەنەکەچی، ئەو پێی گوت کە: بۆ چاککردنەوەی نزیکەی (چوار ملیۆن) دیناری عێراقی دەوێت!

دەزانی زۆرێك لە ئێمە لە سەر ئەم هێلکەی زەوییەو لە ژێر ئەم دەواری ئاسمانەدا بەوەی هەمانە قەناعەت ناکەین؟ تا زیاترمانبێت، زیاترمان دەوێت، سەیر لەوەدایە هەندێجار بۆ خۆمانیش نازانین بۆچیو لەپای چی، ئەم هەموو هەوڵو کۆششە؟!

ئۆتۆمبێلێکت هەیە حەز لە یەکێکی باشتر، یا دووان دەکەیت، بە خانوویەكو دووانو نهۆمێكو شەشو حەوتەوە داناکەوین.

لەو ڕۆژگارەی ئێستادا گرێی وتووێژ لەگەڵ هەرکەسدا دەکەیتەوە، بێزاری دەردەبڕێت، لە هەوڵدان ماندووە، لە دەست هەراکەو بگرەو بەردە کۆڵێك پەژارەت بۆ هەڵدەڕێژێت، کەچی هیچ کاممانیش دەستبەرداری نابین، کەممان هەیە بۆ زۆر ڕادەکەین، زۆرمان هەیە بۆ زۆرتر - نازانم بۆ کەیو کوێی کۆدەکەینەوە؟

ناڕازیبوونو چێژنەبردن لە بوونەکانمانو خولانەوە بە دوای زیاتردا، هەندێجار ئەوانی دیکەشمان لە دەست دەردەهێنێت. بەڵێ خۆ بەندە قسەم لە سەر ئەوە نییە کە هەر دوو قڕانت پەیدا کرد ئیدی پاڵی لێبدەیتەوەو وابزانی ئەملات بەو لادا ناوە، نا، ئێمە دەڵێین کە هێندەت هەبوو ژیانێکی سەربەرزانەو خۆشگوزەران پێکبهێنیو دەست لە کەس پان نەکەیتەوە، ئیدی بە ژیانیشت ڕابگە خۆت لە هاوسەرو منداڵەکانت نزیك بکەرەوە، لە گەڵیان دابنیشە، بچنە گەڕانو سەردانی خزمو خوێش... چێژ لە ژیان وەربگرن.

ببورن، خەریکە لە باسەکەی خۆمان دوور دەکەوینەوە، لە ڕاستیدا قسە قسەت بە تووشەوە دەکات. جا گوتمان کابرا بۆ چاککردنەوەی فوپاوییەکی بچوك خەریکبوو سەری خۆیو ئوتومبێلەکەشی بکات بە گۆما. بە واتەی کوردەواری: بۆ ڕیش چوو، خەریکبوو سمێڵیشی دابنێت!

ڕەنگە زۆربەمان لە بیرمانبێت کە هەریەکەمان لە ئاستی خۆمانەوە لێخوڕی ئۆتۆمبێلە گەورەکەین (ژیان)! ئەودەم بۆ فوپاویو ناتەواوییەکانی ئەمیان چ بکەین؟ لە لای کام شارەزا چاکی بکەینەوە؟ ئایا پێویست دەکات بۆ بچوکترین کێشەو ناتەواوی یەکسەر بەرەو وڵاتو شارو جێگەیەکی دی وەرێکەوین؟ لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا فێری لێخوڕین نەبووبین؟ ئایا هەر پێمان لەسەر بەنزینەکە دابنێین، ئیدی خۆی ڕێكوڕاست ملی ڕێگە دەگرێت؟ لە کاتێکدا هیچ کام لە فەرمانو وەستێنەری ئۆتۆمبێلەکەمان بە دەستەوە نەبێت؟ بێگومان نەخێر.

لە بیرمە بە لێخوڕێکی ژیریان گوت: خێرا برۆ با زوو بگەین، گوتی: نەخێر بۆ ئەوەی زوو بگەین هێواش دەڕۆم!! ئەم پەیامە پێمان دەڵێت: گرنگ خێرا ڕۆیشتن نییە لە ژیاندا، گرنك بەردەوامییە با هێواشیش بین، چونکە بەردەوامی درەنگ، یا زوو گەیشتن مسۆگەر دەکات. ئەمە بۆ هەموو کاتێك ڕاستە، تەنانەت ئەو کەسەی لە سەرەتاوە باسمانکرد ڕەنگە ئەویش خێرا ڕۆیشتنو زوو گەیشتنی بە یەکەوە بەستبێتەوە.

کەوابوو ئێستا هەمووومان دەزانین کە چەندە بەرپرسیارین لە دەوروبەرمان، لەوانەی دێنە نێو (ئۆتۆمبێلی ژیان)مانەوە، پێویستە زۆر ئاگاداریانبین، لە هەڵدێرو هەورازەکاندا لە سەرخۆو، چاوکراوە بین لە ئاستی ڕەگلەکانی ژیاندا، تا بۆ هەمیشە ئەنگوستی پەشیمانی نەگەزین، پێویستیش ناکات بۆ فوپاوییەکی کەمی ئۆتۆمبێلەکەمان تەمەنێك بە فوپاوی دابنیشین، هەموو کێشەکان بچوکن با بە بچوکیش بیانبینین. دەرگاکانی خۆشبەختی هەمیشەکراوەن، ئەگەر ڕەشەبای بێئومێدی پێوەیان نەدات!

بۆ کۆتاییش دەڵێم: ناکرێت ڕێگەی ژیان بێ کۆسپو بەرزونزمی بێت، دەنا هەر زوو خەو دەمانباتەوە!

گوڵان حەمە ئەمین



# تۆ تەنها خاوەنی مەعنەوییەکانی نەك مادییەکان

وامەزانە هەمیشە تۆخاوەنی جوانی بەرزی ماڵ و سامان و ناوو شۆرەت و لەشساغی، زانست و هاوڕێ و خزموکەس و کورسی و دەسەڵات.. چاوەڕوان مەبە هەمیشە دڵخۆش بیت، گەنج بیت، سەرکەوتوو بیت، خاوەن باوەڕبیت، چاوەڕوان مەبە، ژیانی دونیا گرەنتی هیچ خۆشی و بوونێکی نییە، بەڵکو خۆمان و ئەوەی هەمانە گرەنتی تەنها چرکەیەکی دی نییە، کە ئێمە خاوەنی بین!!

چەند جوانمان دی جوانییەکەی زوو ماڵئاوایی لێکرد!! چەند سەرمایەدارو خاوەن سامانمان دی، بوونە هەژارو لێقەوماو!! چەند لەشساغمان دی، بوونە زەلیلی سەرجێگا، چەند دڵشادو کامەرانمان دی، توشی نەخۆشی خەمۆکی بوون و بێزاربوون!! چەند خاوەن تایەفەو عەشیرەتمان دی بێکەس مانەوە!! چەند... هتد؟

ئازیزان ئەمانەو چەندانی تریش ڕاستن، بۆ ئەوە باسمان نەکرد کە بێ ئومێد بین، بەڵکو هەریەکێك لە نازو بەخششە خواییەکانی ژیانی دونیا جێی دڵخۆشین و هۆکارێکن بۆ بەختەوەری دەروونی، هەموو یەکێ لەمانە بەخششێکی کاتین، بە ئەمانەت پێمان دراوە، بۆ کاتێکی دیاریکراو، پاشان لێمان دەسەندرێتەوە، بەڵام کەسی واهەیە ژیرو دانایە لێناگەڕێت هەلی لە دەستبچێت، بەڵکو لەهەر کاتێکدا کاری خۆی دەزانێت، هەیە جوانییەکەی هێندە ڕەوشتبەرزی و پاکی تێدایە، وادەزانیت فریشتەیەکە لەسەر زەوی نیشتەجێبووە، هێندە ڕووخۆش و دەم بەخەندەو نهێنی پارێزو وتە شیرینە، بەڕاستی ئەم جۆرە کەسە هیچ کات نییە بکەوێتە نیگەرانییەوەو خەڵکی پشتی تێبکەن، چونکە وتەی شیرین و ڕوویخۆش سێ پاداشت بە خاوەنەکەی دەبەخشێت، یەکێکیان ئەوەیە خۆی دڵخۆش دەکات، یەکێکی تریان بەرامبەرەکەی دڵخۆش دەکات، ئەویش خۆی بە قەرزار دەزانێت، هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدایە وتەی جوان و ڕوویخۆشی لە بەرامبەردا بە کاربهێنێت، هەروەها پاداشتێکیش لای پەروەردگار، بەڵام بەپێچەوانەوە، هەیە ئەو نیعمەتەی لێدەبێتە نیگەرانی بە خۆ بەزلزانی و لوتبەرزی بەکاریدەهێنێت.

ئەمەش یەکەمجار خۆی تووشی نیگەرانی دەبێت، هەروەها دەوروبەریشی حەز بە لەناوچوونی ئەو نیعمەتانە دەکەن لەسەری، بە هەمان شێوە هەندێ مرۆڤ خاوەن سامان و ماڵ، یاخود کورسی و دەسەڵات، یاخود زانست و زانیاری، یاخود... دەتوانن بە جۆرێك بە کاریبهێنن کە هەم ببنە خۆشەویستی نێو کرۆکی دڵەکان، دەوروبەرەکەیان دەبنە قەڵغانێك بۆ پاراستنی ئەوەی هەیانە، هەروەها خۆشییەکی مەعنەوی وەهای دەستدەکەوێت بەنرختر بێت بۆی، لە تەواوی لایەنە مادییەکانی، بەڵام بەداخەوە کەسانێك هەیە ناتوانن سوود نە بەخۆیان و نە بەدەوروبەریان بگەیەنن، بەڵکو دەبنە نیگەرانی و کێشەو دڵتەنگی، بوونی ئەمجۆرە کەسانەش وەك نەخۆشییەکی کۆمەڵایەتی بڵاودەبێتەوەو خەڵکی لە سەر

پەروەردە دەبێت، ئـەو کات کۆمەڵگایەکی شڵەژاوو نیگەران پڕ لە ئەنانیەت و ئیرەیی دروسـت دەبێت، بەرهەمەکەشی خەمۆکی و خۆکـوژی و خەڵککـوژی دەبێت، ئەوەی مەبەسـتمانە ئـەوەی هەمانـە نەیکەینە مایـەی لوتبـەرزی و وابزانین هەرگیز لە دەستمان ناچن، خۆمان بەسەر کەسانی دی کـەوە هەڵبنێین، گەر کەسـێکمان دی کە لە تاقیکردنەوەی پەروەردگاریاندا تووشی بەڵایەك، ئازارو نیگەرانییەك بوون، یاخود یەکێك لـە نازونیعمەتەکانی دونیایان لێ وەرگیراوەتـەوە، لـە بـەر حیکمەتێك کە ئێمە نایزانین!!

بەڵام کەسانێکی بێ بیروهۆش بێهەست و سۆز، بێ ئەرزش، وەك دەوترێت دەیکەلە بنێشتە خۆشەی سەرزاریان، ناوی دەزڕێنن، بەڵکـو دەیکەنـە گاڵتەجـاڕی نێوقسـەو باسـەکان!! وادەزانـن ئەو کەسـەی ئەوی توشی ئەو تاقیکردنەوەیە کردووە لەوانی دی بێ ئاگایە!! نازانن دونیا شوێنی مەشق و ڕاهێنانێکی سەرسوڕهێنەری وەهایە کە هەرکەسـەو بـە جۆرێـك دەخرێتە بەر ئەزمون و تاقیکردنەوە تابۆ قۆناغێکی تر تۆکمە بکرێت!!

خوێنەرانی زێدە ئەزیز ئاخۆ ئێمەش ڕۆژێـك بـووە دڵخـۆش بین بە شـکانی کەسـێك، یاخـود بە نیگەرانـی و ئازاری کەسـێك!؟ ئەمە پرسـیارێکەو پێویسـتە هەمـووان ئاڕاسـتەی خۆمانـی بکەیـن، چونکە بەڕاسـتی هیـچ بەرزەفڕێك نییە کـە نـزم نەکرێتـەوە، هیـچ لوتبـەرزو لەخۆباییەك نییە کە تووشـی سەرشۆڕی نەبێـت!! چەندجوانـە بەرێـزەوە بژین بەرێزەوە ژیان یەکسـانە بە ڕێزگرتن لە کەسانی دی، بە خاکی بوون و نەرمونیانی بژیـن، وانەزانین ئێمـە دەربازدەبین لە تاقیکردنەوە!! بەڵکو باهەمیشـە ئەوەمان لە پێشـچاو بێت کە خۆمان لە جێی ئەو کەسـە دابنێین کە نزیکە لـە ناخمانا لە خۆباییبوون دروسـت ببێـت بەرامبەری، وابزانیـن ئێمـە لـەو باشـترو چاکترو جوانتریـن، وتـراوە گوڵەگەنـم کاتێـك سـەردادەنەوێنێت کە پـڕە!!! بابیکەینە نەریـت کە نهێنی و کەموکوڕی کەسـانی تـر داپۆشـین، ڕەنگـە ئـەو هەڵەیـەی کە لـە کەسـێکمان دی، خۆی پەشـیمان بووبێتـەوەو خـواش لێی خۆشـبووبێت، ئێسـتا ئەو هەڵەیـە لای بووبێتە کارێکی قێزەون!! بەڵام ناوزڕاندن و ئاشکراکردنی لە لایەن کەسـێکەوە ناشیرین و نادروست و پێچەوانـەی بەهابااڵکانە، بۆ دەبێت بە شـکاندنی کەسانێك خۆمان بەرزکەینەوە، ئـەی بۆ ناکرێت بە خودی جوانی و پاکی خۆمان، خۆمان بەرزنەکەینەوە؟

خوێنەران و هاوڕێیانی بڕیار وەرن بە لە ژووانـی خوێنەرانی بڕیاردا پەیمانێك مۆرکەین، چاودێرێك بکەینە چاودێرمان کـە هەمیشـە بـە ئاگایـە بـە نهێنی و ئاشـکراکان، بەڵێن بدەین چیدی دڵخۆش نەبین بە نزمی و شـکانی هیچ کەسـێك تاخۆمان بەرزکەینەوە، چونکە دوورنییە ئێمـە لەو خراپترمان تـوش نەبێت، ئەو کات حەزناکەین چاوپۆشـیمان لێبکرێت، حەزناکەیـن هەڵەکانمان بـاس نەکرێت؟ بێگومـان بەڵێ حەزدەکەیـن، کەوایە بۆ زمانمان بکەینە هـۆکاری بڵاوکردنەوەی ناشـیرینی، بۆ نەبینە هۆکاری گەیاندنی ڕەوشتی جوان، لەجێی شکاندنی کەسانێ؟ با چیرۆکە جوانـەکان بگێڕنەوە با وتەو هەڵوێستە بەرزەکان بنرخێنین.

لێگەڕێن باجوانییەکان، پاکییەکان باس بکەین، تاجوانییەکانمان، پاکییەکانمان باس بکرێت، باشانازی نەکەین بەوەی کەسانێك هەڵەیان کردووە، ئێمەش هەڵەمان هەیە، چونکە نمونەی ئێمە وەك ئەو کۆمپیوتەرە وەهایـە کەلە بەردەسـتماندایە، گەر ئەو کۆمپیوتـەرە وابزانێت کـە ئەو دیزاین و پڕۆگـرام و بەرنامانەی کە تێیدایە خۆی خاوەنییەتـی، بەڕاسـتی ئەمـە هەمـوو ژیرێـك دەزانێت کە ئەوپـەڕی نەزانییە، چونکـە دروسـتکارێکی هەیـە، هەر ئەو دروسـتکارەش بەرنامـەو پڕۆگرامـی تایبەتـی بۆداڕشـتووە، ڕۆژانـە تووشـی چەندین گرفـت دەبێتەوە، لـە چەندین ڕێوە ڤایرۆسی بۆ دێت، هەمووکات دەبێت ئەو خاوەنەی دروسـتیکردووە چارەسەرو پارێزەری بۆ دابنێـت، هەر ئەو ئامێرەی کە چەندەها گێـگا زانیاری لە خۆگرتووە دەگونجێـت لـە چرکەسـاتێکدا لەنـاو بچێـت، مرۆڤیش بەم شـێوەیەیە، خۆی خاوەنی ئەوە نییە کە لەبەردەسـتیایەتی و پێیـدراوە، خاوەنێکـی هەیە هەمیشـە دەیپارێزێـت، هـەرکات بیەوێـت ئەوەی پێی بەخشیوە لێی وەردەگرێتەوە، کەواتە شـانازی کردنی بەوەی هەیەتی گێلییەکی زۆر سەرسـوڕهێنەرە، بـا شـانازی بـە شـتە مەعنەوییەکانـەوە بکەین، چونکە ڕەوشتەجوانەکان، چاکەو مامەڵەڕاستەکان، وتەشـیرین و ئامۆژگارییـەکان، ئێمەیـن دەتوانین ئەنجامی بدەین.

ئازاد محێدین

## هەورێک گریا

هەورێك گریا
گوڵێك ڕوومەتی پاك شۆری
بنجە گیایەك
قژی شۆڕاوی شانە کرد
مێروولەیەك
لە تاریکی درزی شارەوە هاتە دەر
دەستی شوکری
بە نێوچاوانیدا هێنا
پەتای گەرووی
کانیلەیەك چارەسەر بوو
بەسۆزترین ئاوازەوە
قوڵپەی ئاوی هۆنییەوە
تەوێڵی بەرزی باڵای چەماند
بەردەنوێژی کانیلەکەی
ماچ کردەوە

زاهیر زانا



# ڕازی سەرکەوتن

بەشێکی زۆری ژیان تاقیکردنەوەو پێشبڕکێیە، بۆیە سەرکەوتن ویستو خولیاو خواستی دڵی هەر مرۆڤێکەو هەریەکێکمان دەمانەوێت شەمەندەفەری ژیانمان تەنها لەو ویستگەیەدا بووەستێت، هەرچەندە سەرکەوتن بەپێی هەر دیدگاو بۆچونێك جیاوازەو هەرکەسەو بەپێی دیدو تێڕوانینی خۆی جۆرێك پێناسەی بۆ دەكاو قاڵبێکی بۆ دادەڕێژێو خاڵێك بەسەرکەوتن دادەنێتو سەرکەوتن بە بەدەستهێنانی شتێکی دیاریکراو دەزانێت لە ژیانیدا، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا کۆمەڵێك چوارچێوە هەن بۆ سەرکەوتن کە زۆرینەی بۆچوونەکان لەسەری کۆکن، چونکە خودی سەرکەوتن تەنها کورتنابێتەوە لەسەر لایەنێکی ژیانو هەموو بوارەکان دەگرێتەوە، هەر لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانو بواری مادیو ڕۆحانیو پێگەی سیاسیو جۆری کارو .....هتد.

دەکرێت ئێمەش لێرەدا پێناسەی سەرکەوتن بکەینو بڵێین: سەرکەوتن بریتییە لە ئەنجامدانی کارێك کە دەبێت ئەنجامی بدەیت، دووربوونە لە شتێك کە دەبێت لێی دووربیت، دۆزینەوەو بەکارهێنانی باشترینو ناوازەترین بەهرەو تواناو لێهاتوییەکانتە، سەرکەوتن ئەوەیە وادڵت ڕابێنی لە ئەنجامدانی کارێکی ئاڵۆزوگران چێژ وەربگرێت، فێربوونە لە ڕابردوو، کۆڵنەدانە لە شکستو زاڵبوونە بەسەر بیرو بۆچوونە نەرێنییەکانداو بەدیهێنانی خەونو خولیاو هیواکانتە، سەرکەوتن ئەوەیە خاوەنی باوەڕێکی بەهێزو هەڵسوکەوتو ڕەوشتێکی پەسەندو بیرێکی ڕەسەنو داهێنانکاربیت.

سەرکەوتن تەنها گەیشتن نییە بە لوتکە، بەڵکو بەردەوام هەوڵدانو بەرەوپێشچوونو هەڵزنانی زیاترە بۆ لوتکە بەرزو بڵندەکانی تر، ئەوەتا پێشەوا (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) دەڵێت: (دەمخواست ببم بە والی، پێی گەیشتم، پاشان ویستم ببمە خەلیفە، کە بووم ئێستا دەروونم داواکارو هیواداری بەهەشتە)... بەڵێ سەرکەوتن وێستگەیەك نییە، بەڵکو گەشتێکەو دەبێت هەمیشە هاوڕێت بێت!

بۆ ئەم گەشتەش چەند بنەماو پرەنسیپێك هەن کە بەرەچاوکردنیان گەشتی سەرکەوتن ئاسانترو ڕێگا تەختترو درەختی ژیان بە بەرترە! ئەم چەند خاڵەی خوارەوەش بەشێکی گرنگی بونیادی ئەو پێك هاتەیەن:

١- دیاریکردنو ڕوونی ئامانج وادەکات مرۆڤ بزانێت چی دەوێتو کارەکانیو دەرئەنجامی هەوڵو تێکۆشانەکانی بزانێتو ئەگەری سەرکەوتنو بەدەستهێنانی زیاد بکات.

٢- جیاکردنەوەی کارەکان بۆئەوەی هەرکارێك لە ماوەی خۆیدا ئەنجام بدرێتو دووربین لە پەرشو بڵاویو سەرلێشێواوی.

٣- دانانی پلەبەندی بۆ کارەکان بە پێی گرنگیو سودو کەڵكو پێویستیانو بوونی نەخشەیەکی ڕوون لە ژیاندا.

٤- بەڕێوەبردنی کات، بۆئەوەی کارەکانت بەڕێكو پێکی بڕوات بەڕێوە، دەبێت بزانیت لە چ کاتێکدا چی کارێك دەکەیتو ئەو کاتە چەند کاتی پێویستە بۆ ئەنجامدانی هەرقۆناغێکی.

٥- سەرنجو دیقەتگرتن، ئەگەر بە وردی سەرنج لە ئەنجامدانی کارەکانت نەدەیت، ئەوا ئەرکەکەت بەڕێکوپێکی بەڕێوەناچێتو توشی شکستو کەموکورتی دەبیت.

٦- لێبوردەییو فیداکاری، ئەو مرۆڤەی ئەم دوو ڕەوشتەی نەبێت هەرچەند پلانو بەرنامەی ڕێكو پێكو دروستی هەبێت، ناتوانێت ئەنجامی باش بەدەستبهێنێت. ئەگەر شتێکیش بەدەستبهێنێت چێژی لێنابینێو نابێتە هۆی بەختەوەری بۆی.

٧- لێهاتوویی پەیوەندیکردن، مرۆڤ بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییەو پێویستە هاوکاری کەسانیتر بکاتو داوای یارمەتیو پشتیوانیشیان لێ بکات، چونکە ئەستەمە بە تەنها بتوانیت بەسەر هەموو بوارێکدا زاڵبیتو لە هەموو بابەتەکاندا وەستابیت.

٨- گەشبینبە لە ئەنجامدانی هەر کارێکدا، پۆزەتیڤو بەئومێدبەو شکست وەك ڕووداوێکی ئاساییو سادە سەیر بکەو لە هەر گرفتێکەوە وانەو پەندێك فێربەو لە خەزێنەی ئەزمونت سودو کەڵك وەربگرە.

٩- بەرپرسیاری ژیانی خۆتبەو هەر بڕیارێك دەدەیت، باش بیری لێبکەرەوەو پاشان دەرئەنجامەکانیشی قبوڵ بکە.

١٠- هەمیشە هەوڵبدە، بەدیهێنانی خەونو هیواکانت بەندە بە هەوڵو تێکۆشانەکانتەوە، بزانە ڕوودانی هەر شتێك هۆکارێکی لە پشتەو گەر پشت بە خودا ببەستیتو هۆکارەکان بگریتەبەر، دەتوانیت بگەیتە ئەوەی خۆت دەتەوێت.

١١- لە ژیانتدا کەسێکی هاوسەنگ بەو پەرگیرو شلگیر مەبەو هەر شتێك بە ئەندازەی پێویستی خۆی مافی پێ بدە.

١٢- ئارامی دەروونی خۆت بپارێزەو هەمیشە خاوەنی مەعنەویاتێکی بەرزبەو ئاسودەیی خۆت بپارێزە، چونکە گەورەترین سەرکەوتن ئەوەیە مرۆڤ لە خودی خۆیدا سەرکەوتووبێتو لە بارودۆخی خۆی ڕازیبێت.

هەوڵبدەو کۆڵ مەدە بە ڕێگای ژیاندا هەنگاو هەڵبگرەو ئەو بنەمایانەی سەرەوە جێبەجێ بکەو کلیلی سەرکەوتن بە دەستبهێنە!

# چۆن کەسایەتییەکی بەهێز بنیاتبنێین؟



ئارام ستاربادلی

کەسایەتی بریتییە لە بوونی چەند بەهاو بنەماو ڕێساو ڕێوشوێنیك کە تاکێك لەسەری دەڕواتو کردویەتییە بنچینەی هەڵسوکەتو ڕەفتاری خۆی، کە هەمیشە پێگەی کەسەکە جیادەکرێتەوە لە کەسەکانی تر لەبەربوونی ئەو خاسیەتە بەرزەی کەسەکە هەیەتی، هەمیشە هەموو مرۆڤێك حەزدەکات پێی بوترێت کەسێکی خاوەن کەسایەتییە، دروستبوون بنیاتنانی کەسایەتییەکی بەرز هەمیشە دەرهاوێشتەی هۆکاری بۆماوەییو ژینگەی کۆمەڵایەتیو دەروونیو پەروەردەی باشوتەندروست و... هتد، بەڵام ئایا بەکێ دەگوترێت خاوەن کەسایەتی؟ بەو کەسە دەوترێت کە توانای کۆنترۆلکردنی کەسانی تری هەیەو توانای هەیە لە زاڵکردنی ڕاوبۆچوونی خۆی بەسەر کەسانی تردا، یان ئەو کەسەیە کە توانای کۆکردنەوەی سامانێکی زۆری هەیە لە ئەنجامدا پێگەیەکی کۆمەڵایەتی بۆ دێتەبوون، یان ئەو کەسەیە کە توانای باشی هەیە لە نواندنی هەڵوێستی بەرزدا، بەڵام تاکی خاوەن کەسایەتی ئەو کەسەیە کە بەردەوامە لە گەشەکردنو پێشکەوتن.

لە بەرامبەردا کەسایەتی لاواز ئەو کەسەیە کە خاوەن عەقڵێکی چەقبەستووەو توانای سودوەرگرتنی نییە لە کاتو تەندروستیو تواناکانیو ڕەفتارو هەڵەکانی خۆی، هەرگیز ناگۆڕێت، ناتوانێت جیاکاری بکات لە نێوان چاکەو خراپەو هەڵبژاردنی چاکو بوونی پێشبینیو بەرنامەی هەبێت بۆ داهاتوو، هەست بکات بە واقیعی ئێستاو چاكو خراپ، بەڵام پێشکەوتنو گەشەکردن مەرجی بنەڕەتین بۆ کەسایەتی بەهێز، بەڵام بۆ ئەوەی کەسایەتییەکی بەهێز دروست بکەین پێویستە چەند ڕاهێنانێك ئەنجامبدەین، بەڵام بۆ ماوەیی خاڵێکی بنەڕەتییە بۆ پێکهێنانی کەسایەتی، بەڵام فاکتەری بۆ ماوەیی بۆ کەسایەتی جێگیر نییەو کارلێك لەگەڵ ژینگە دەکات لە کاتی لە دایکبوونو هەلمان بۆ دەرەخسێت بۆ گۆڕینی ڕەفتارمانو ڕاستکردنەوەی هەڵەو کەموکوڕییەکانمان بە تایبەتی دوای گەورەبوونو وەرگرتنی پەروەردەیەکی ڕاست، لێرەدا هەندێك ڕاهێنان دەخەینە ڕوو بۆ بەهێزکردنی کەسایەتی:

١- ڕاهێنانی جەستەیی، وەکو ڕاهێنانی لیاقەو جوڵانو ڕاستکردنەوەو چۆنیەتی دانیشتنو وەستان.

٢-ڕاهێنانیویژدانیوەکوخۆتەرخانکردنی کارلێکەریو دەربازبوون لە ترسو فێربوونی ئازایەتی.

٣- ڕاهێنانی ژیری، وەکو بەهێزکردنی یادگە (ذاکرە)و خەیاڵکردنو توانای گفتوگۆکردنو باوەڕبەخۆبوون.

٤- ڕاهێنانی زمانەوانی، وەکو ڕاهێنانی خوێندنەوەو نووسینو... هتد.

٥- ڕاهێنانی کۆمەڵایەتی، وەکو ڕاهێنانی دروستکردنی پەیوەندی نوێو پاراستنی سەربەخۆیو کۆتایهێنان بە پەیوەندی خراپو... هتد.

٦- خۆڕاهێنان لەسەر نواندنی هەڵسووکەوتی باشو ڕەوشتی بەرزو سەردەمیانەو دوور لە توندوتیژی.

٧- دوورکەوتنەوە لە قسەی بێماناو زۆر وتنو قسەی ڕاستو دروستو دوور لە ناڕاستی.

بەپێی بۆچوونی کۆمەڵناسان کەسایەتی دەوەستێتە سەر فاکتەری ژینگەو بۆماوەیی، بەڵام زیاتر دەکەوێتە سەر ژینگەی دەوروبەر بە پێی بۆچوونی شارەزایان هەموو کەسێك کەسایەتییەکی تایبەتی بە خۆی هەیەو لە کەسێکەوە دەگۆڕێت بۆ کەسێکی تر، لە ڕووی بەهێزیو لاوازیو مامناوەندی، پێیوایە بوونی کەسایەتی خۆی دەبینێتەوە لە ئاگاداربوون لەو وتەو ئاخاوتنانەی کە دەیڵێتو دەبێت گوێ لە خەڵکی بگریت، بوونی زەردەخەنەو گەشبینی نەك پێکەنینی قاقای بەهێزو بوونی زمان شیرینیو پاراوی، بوونی ڕاستگۆیی لە هەموو کاتو شوێنێك، بەشداریکردن لە بۆنەکان بە ڕێژەیەکی جیاواز، پابەندبوون بە بەڵێنەکانو دڵسۆزبوون لە کارەکاندا، بوونی ڕۆشنبیرییەکی باش لە هەموو بوارەکاندا، بوونی سادەیو نەرمیو خۆبەگەورەنەزانین.

پرۆسەی بنیاتنانی کەسایەتییەکی بەهێز، زۆر پێویستە بۆ هەموو کەسێك، بۆ ئەوەی لە ژیاندا بتوانین بە خۆشی، دوور لە ڕاڕاییو ناسەقامگیری ببەینەسەر، هەمیشە پێویستی بە کاتێکی درێژخایەنو ماندووبوونو قوربانیدان هەیە.

بەڵێن ئەنوەر



# فەنابوونی کەشتیەکان

کاتێك پێنوسـەکەم دەدوێنم، پیتەکان دەبن بە وشـەو وشـەکانیش بـە خێرایی بەسەر پردی تەمەنمدا گوزەردەکەن، هەتا لـە کەنارێکی بێدەنگیدا ڕسـتە ڕیـز دەبن. دەمانەوێت ژوانێك سـازکەیـن، دەمانەوێت سـاتێك لە یەکتر تێبگەیـن، تاکو بتوانین تـۆزو گـەردی غەمەکان لەسـەر جەسـتە سڕەکانی ڕۆژگار بسڕیـن. من کە ئەندێشەی سەمەرەی زەمەنم دیوە، پەنجە ساردەکانی زسـتانم پەڕیوە، ئیلهامە ئەفسوناوییەکانی دوای بارینـی بارانـم بۆچییە، گەر ڕاسـتی پێکی، ڕاستی بەرببارانم نەبن!

مـن کـە دێمـە گـۆ، دڵو ڕۆحـم کەمەندکێشـی مەیدانـی حـاڵ دەکـەم، سـاتەکانی تەمەن یەك بە یەك دەژمێرمو تێیان دەگـەم، کاتێك دیمەنێك دەشـێوێ، یـان تابلۆیـەك ڕەنگەکانـی ژیـان تێکەڵ دەکات، یـان بەهار ڕووی گـەش نییە، خۆ لـە کەمتەرخەمی گوڵ نییە، کەم لە ڕەنگی شـەبەنگ نییە، بەڵکو ڕاسـتی مەحکومی زیندانێکی بێ حاکمە! کاتێك دەسـتەواژەی کۆتا دەبڕم، ڕسـتەکانی سەرەتام لێدەگۆڕن، تۆ سـەیری ئەم حەشـاماتە بە وەجهو بێ ڕۆحـە، ئـەم نامە بێ ناوە، چـی ڕوویداوە لەم بەینەدا من نازانم! بە ئەسـپایی خۆم دەخزێنمـە پاڵ دیوارەکانـی هیجرانەوە، نەوەك باڵدارەکان بفڕن، یان لە ناو تاریکی شەوەزەنگدا بێدەنگ دەگریم، نەوەك ڕستە ڕیزەکانـی ئەمجـارەم بێ ناوونیشـانکەم. زۆرجـار دەمەوێ پڕ بە هەموو دونیا هاوار بکەم، بـەڵام کە بیردەکەمـەوە دەڵێم: تۆ بڵێی هیچ کەسێك لێم تێبگات!؟

پردەکانـی ئەمـڕۆ بێ کەڵکـو لاوازن، تاکو دەستی کەسێك دەگرن «فیراقی هەزار ڕۆحی پـاك دەخولقێـنن، تا زمانێکی نوێ دەپژێت، سەد زمانی بەر مەیدانی فەساحەت دەبڕێـت! من کە ڕابوونی چنگێ بم بـۆچی ڕابـم؟ سـەکۆی ڕاسـتییەکان بڵنـدە، بەڵام شوشـەی ڕۆحی ناسـاز لێڵو مەنگە»، من حەریفی دەریای حەریفم، بۆ نـەبم، دەڕۆم تا ئاگری ئاشـوبی وەختـە نەمگرێ. مەلی بێ باڵ بەرۆکی ئاسـمانی بەرداو سـۆراخی نانی گرتەبەر، سـپێدەی سـۆزی ئاوازی بۆ سـەر جێهێـلا، دەی ئێوەش کە پـەروازی حاڵێ نین، مەلەرزێنن ڕۆحی شوشە، وشەی لاوازی زەوی مەچرپێنن بە ئاسماندا... وەك چۆن منەتی نووسەرێك پێنووسەکەی هەڵی دەگرێـت، چونکە ئامـاژەو ئاڕاسـتەی خاڵی دەسپێکی لێ ونە، بەڵام کە خاڵی سەرەتای پێکا ئیتر ئاوێتەی عەقڵو ناخی نووسـەر دەبێتو وەك کەشـتییەك بەناو ئۆقیانوسی وشـەکاندا مەلە دەکات، ڕاستییەکان لە ناو قوڵایی دەریادا دەدۆزێتەوە، ئینجا تێدەگات کـە تا چەند لە پێناو گەیشـتن بە ئەوجی یەقین قوربانی داوە.

بەڵـێ منیش خامەی دەسـتم ئامـاژەیە بۆ گەیشـتن بە لوتکەی هیوا، چونکە زاخی جەوهەری ئەو هزرو عەقڵی زاخاو داوم، بە تەعبیـرە ڕۆحییەکانم پەردەی دڵم یەقین پـرژێـن دەکەم.

کاتێك ئاوێنەکانی ژیان دەبینم شـێوەو هونەری ژیانزانی فێردەبم، فێردەبم کە چۆن بنچینەی ڕۆحی لێکتێگەیشتن بینا بکەم، تا لە زەجرو گۆمـی ژیاندا نەخنکێم، چونکە بینای بـەرزی ژیان بە هەناسـە قوڵەکانی لێکتێگەیشـتنەوە بەندە، نەك ڕووخسـارە گرژەکانـی ماڵئاوایی کـە بەژنوباڵای خۆر دادەپۆشـنو گەردی تەمی ماڵاسدراویان بە ئاسـمانی ڕوونەوە جێدەهێڵنو ڕووخساری مانـگ تاریك دەکـەن. گەر من شووشـەی دەستی جەفای سوچی خەم بم، خۆ دەتوانم چیرۆکی سەرمەشقی ژیان بنووسمەوە، وەك پەیامی دەستی مەلێکی پەیامهەڵگر پەیامی خۆم بە گشت خەڵکی ئەم جیهانە بگەیەنم. دەڵێـم گفتـو مامەڵەی ڕۆحـە تۆراوەکانی ڕۆژگار دەبێ چی بێ، کاتێك سەودای دەستی ڕۆحی شەڕانگێز بن؟

خـۆ سـاتەکاتی ژیـان ڕاناوەسـتن، کاتێـك چاو بۆیـان دەڕوانـێ، هێندەی تر خێراتر دەبـن، چرکەکانیش خێرا دەکەن، چون لە دەنگـی چرکەکانی (مایسـترۆی) سـەعات ژەنـن، منی جێماو چـۆن بتوانم ئەسـرینەکانی بەرباران فەرامۆشـکەم، یان تریشـقەی هـەوری ناخم قەتیـس بکەم؟ بەڵام لای من ئاساییە گەر هەنیسکی شەوی تاریك تێکەڵ بـە ڕۆژی ڕووناك بکەم، یان لەناو دەسـتەی ئاوازێکی غەزەلیدا سـازی موخالیـف بژەنم، لە توانجیش ناسـڵەمم، ئەوەی دەیڵێـن: بەرامبەرم هـەر ئەمەیە: (ئێمەین مامۆستای ڕستەو فەرهەنگ، ئێمە

ئاوێنەیەکمان بڕیوە.) منیش دەڵێم: ئەی بۆ لە واتای ڕەنگی وێنەی ڕووی ئاوێنەکە تێناگەن!؟ لە پەراوێزێکدا گەر بڵێم «من تێناگەم»، دەڵێن: لەگەڵ ئەو هەموو بابەتە قوڵو شعورە بەرزەدا دەڵێ تێناگەم! منیش لە وەڵامدا دەڵێم: من تێناگەم لەوەی کە بۆچی تێناگەن، تەنانەت لە تێنەگەیشتنیشم تێنەگەیشتن!!

ئێستا یاسای من ئاوایە: گەر خەم بخۆم، گڕکانی ناخم پەنگ دەخوا، گەر بێدەنگ بم، هێندەیتر ناخم قوڵپ دەدا، گەر سەرسام بم بە دەنگی گڕکانی ناخم، هەموو خەڵکی ئەم دونیایە گوێبیست دەکەم، جا پەیامی زمانحاڵی پەیامی خۆم لەسەر پەڕە سورەکانی ماڵئاوایی دادەڕێژم، تا خەڵکانی بیسەری خۆم، شایەدی شەیپوری شەڕی شارە جەنجاڵەکەی ناخم کەم! کاتێك بەری ڕووناکی خۆرم لێدەگرن، یان بەردی وێڵی ڕۆژگار شوشەی پەنجەرەی ژوورەکەم دەشکێنێ، وا هەست دەکەم ئیتر هیوایەکم نییە، گەر مانگ لە ڕووخسارم تۆرا، یان ژووری بەر خۆرم گۆڕا، چلۆن خەندە ئاشت کەمەوە، یاخود لە دوای ئاشتی ئەویش چۆن بتوانم سرودی خۆشی ژیان بنووسمەوە، بە کام ڕۆحی بڕیارەوە داوای زەنگی ئاوازێکی تازە بکەم؟

سەیری ئاسمانی شەو دەکەم، ئەستێرەکان سەرسامی حاڵم دەکەم، کاتێك ئەوانیش دەڕواننە بەژنی شەو، هێندەیتر خامۆشی دەکەن!!

من نووسەری ڕازی کەس نیم، تا دەستور بۆ ڕازی ژیان دابڕێژم، لەو بەینەدا من نەوزادی ژیانێکم هاتوم، تاکو بە هێمنی لە کەنارێکدا پشوو بدەم، خۆ من چارەی چارەنوسو بەختی کەس نیم، تا دروشمی شەڕی دەروون بخولقێنم، گەر بێ ئاگا خۆم لەو مەیدانەشدا بینی، هەرگیز خواستو چارەنووسی من نەبووە، بەڵکو فشاری دەرونێ دەرگای ڤینی والآکردووە، ئەوا منم لەو بەینەدا باجی چارەنوسی ئەو دەدەم!

کاتێك درەختێکی وەریو، یان باسەکانی قامەتی شەو سەرهەڵدەدەن، دەریای پیتو وشەکانم شەپۆل دەدەن بەناو یەکدا، کەشتییەکانی دەریای ناخم ئاڕاستەو نیشانەکانیان لێ دەگۆڕێ تا لە ناکاو فەنا دەبن، منیش کاتێك دەڕوانمە دەریای وشەکانم، سەرسام دەبم، تا لە ناکاو لەگەڵ کەشتییەکانی فەنابووندا فەنا دەبم!! ئیتر ئاسەواری گەنجینەی وشەکانم بەدەم تەوژمە ساردەکانی دەریاوە کەنار دەگرن، هێدی هێدی بەسەر خێزاوە سورەکەی دەریای ڕۆحمەوە دەنیشنوو گەواهیدەری مێژووە دێرینەکەی منن..



# بە هەگبەی بە تاڵ لەسەر سەفەرم

ئاسۆ حاجی

بەیانی لەگەڵ ژاوەژاوی ئۆتۆمبێلو هاتو هاواری عەرەبانچیو مندالآن، خەبەرم بووەوەو سەیرێکی سەعاتە هەڵواسراوەکەی دیوارەکەم کرد، کات ببووە (١٠:٤٥) خولەك، وتم تازە درەنگە ناچم، چونکە شەو کەچوومە ناوجێگاکەم بڕیارم دابوو بە یانی بچم بۆ پە یمانگەی کۆمپیوتەر، بۆ خولی فێربوونی کۆمپیوتەر، بەڵام تازە درەنگە، بەیانیش هەینییەو پشووە، کەواتە شەممە دەچم، ئەو ڕۆژە بە یانییەکەم بە خەوتن بردە سەر، پاشان وتم دوای عەسر دەچم بۆ سەردانی ئەو هاوڕێیەم کە سێ ڕۆژ لەمەوبەر سەیارە لێیدابوو، لە نەخۆشخانە خەواندبوویان، کە عەسر داهات وتم: ناچم بۆ نەخۆشخانە.

چونکە قەرەباڵغەو پێویست ناکات، ئەوێ جێگای نەخۆشە، نەك سەردان، بۆیە کە هاتەوە ماڵ سەردانی دەکەم، ڕۆژەکانم ئەوها بەسەردەبرد، ئێستا نا دوایی، بەیانی نا، نیوەڕۆ، عەسر نا شەو، شەوانەش یا لە پیاسەو پارکەکان بووم، یا بە دیار تەلەفزیۆنەوە سەیری یاریم دەکرد، جگە لە فلیمو دراما تادرەنگ بە دیارییەوە خەو دەیبردمەوە، شەممە هات، نەچووم بڕیارەکەم گۆڕی بچم، بۆخولی زمان، ئەویش بە ئەمڕۆو سبەی بردمە سەر، بە بێئەوەی سەردانی سەنتەری زمان بکەم، بەردەوام شەوو ڕۆژم، بەمڕۆو سبەی بەڕێدەکرد، بە بێئەوەی بەشداری لە هیچ خولێك بکەم، ئەمجارە وتم دەچم بۆ وەرزشکردن لە هۆڵی وەرزشی، ئەویش بە بەهانەی دووریو گرانی نرخو ئەوە باش نییەو ئەوەیان باشە بەڕێم کرد، هەرساڵێك دەسوڕایەوە دەمگوت: ئەمساڵ ئەوە دەکەم، خۆم فێری فلان کار، یان هونەر دەکەم، ئەمجارە وتم دەچمە خولی مۆسیقا، نا دەچمە خولی خۆشنووسی، خولی وێنەکێشان، دەمگوت: لە سەری مانگ دەست پێدەکەم، سەری مانگ دادەهات، با ئەم دە ڕۆژە بڕوات، ئینجا نا، لە ناوەڕاستی مانگ، نا مانگێکی دی، بەردەوام خۆم دەدزییەوەو فێڵم لە خۆم دەکرد، بۆ سەردانکردنو میوانیش هەروابووم، دەمگوت: ئەم شەو نا، شەوێکی تر، بەبێئەوەی هیچ هەست پێبکەم شەوەکان دەڕۆیشتنو منیش هەروام دەگوت، شەوێك بە دیار تەلەفزیۆنەوە دانیشتبووم، بینیم لە ژێرەوە نووسراوە فلان کەس سبەی دووەم ڕۆژی پرسەکەیەتی، کە بەکارەساتێکی دڵتەزێن کۆچی دوایی کرد، ئەو هاوڕێیەم بوو، کە لە نەخۆشخانە نەچووم بۆلای، بۆ پرسەکەشی بەم شێوە ڕۆیشت، تائێستاش نەچووم..

تەمەنم وائەمڕۆ بوو بە ( ٤٥) ساڵی تەواو، بە بێئەوەی فێری کۆمپیوتەرو ئینتەرنێتو زمانو ئەوانی تریش ببم، ئێستا وا لە ناو جێگا کەوتووم، جەڵتەی دڵ شەپرێوی کردووم، دەستم لەرزۆك بووەو هەگبەی ژیانم بە تاڵ نە کەسێکم فێری هیچ کرد نەخۆم فێری هیچ بووم، نازانم سودی بوونی من لە دنیا چییە؟! کەوا ئێستاکە لە سەر سەفەرم تەنیا ئەوەندەبێت جێی کەسێکم گرتووەو نانی قوتابییەکی زانستخوازو زانایەکی هەژارم خواردووە، چونکە کە منداڵ بووم پێویستم بە خەوی زۆربوو تاتێرخەوبم، پاشان گەنج بووم لەبەر گەڕانی بێ سوود، زۆرماندوو دەبووم، دیسان پێوستم بە پشوو بوو دەخەوتم ئێستاش نەخۆشم پێویستم بەپشووە، لەگەڵ ئەوەشدا تائێستا تێرخەونەبووم، لە ژیانیش بۆخۆمو دەوروبەرم هیچ فێرنەبووم!

ئێستا بەو درەنگە زانیوومە من کەسێکی زۆرماندوو بێبەرهەم بووم!



# بۆ هەموو ئەوانەی دەیانەوێت لایەنە گەشەکانی ژیانیان بدۆزنەوەو ئاواتەکانیان بهێننە دی

و: چیا عەبدوڵ

بۆ ئەوانەی پێویستیان بە هەڵوێستەیەکە بۆگەڕانەوەو هەڵسەنگاندنی خودی خۆیانو دیاریکردنی ڕێگای ژیانیانو چارەسەرکردنی کێشەکانیان..

بۆ هەمـــوو ئەوانەی دەیانەوێت تەرکیز بخەنــە ســەرهەوڵەکانیانو تواناکانیـــان ئاڕاستەی سەرکەوتنەکانیان بکەن..

ئەوانەی دەیانەوێت هانی خۆیان بدەنو پاڵنەرەکانیـــان بەهێز بکەن بۆ گەیشـتن بە ئامانـــج، ئەوانـــەی دەیانەوێت ترســەکانیان لەناوبەرنو متمانەیان بەخۆیان بەهێز بێت.

ئایـــا دەتەوێت بەوجــۆرە بیت؟ کەوایە لەگەڵمـــان بە، هەرجـــارەو هاوکێشـــەیەکی دەروونیت پێدەناســێنینو بەخۆتت ئاشــنا دەکەین.

* لەتایبەتمەندییەکانـــی ژیانە کە پڕە لە ناخۆشـــیو قورســایی ســەر شــانت زیاد دەکات، بەرپرســـارییەکانت زیـــاد دەکات، پابەندبوونەکانت باڵاتر دەبێت، پاڵەپەستۆکان گـــەورە دەبن، ناســـۆرییەکانت زۆر دەبن، بە هـــۆی هەوڵەکانتو کۆبوونەوەی کێشـــەکان، ڕووبەڕووی ڕێگرییەکان دەبیتەوە.

ئێســـتا بووەســـتە با لێت بپرســـم: چی دەکەیت ئەگەر بەڕێوەبەری کارەکەت داوات لێبکات واز لە کاربهێنیتو ئیتر نەگەڕێیتەوە سەر کارەکەت؟

دەزانیت بۆچی؟

لەبەرئەوەی کەسێکی تری دامەزراندووەو بە نیوەی موچەکەی تۆش کاری بۆ دەکات!

یا هاوڕێ دێرینەکـــەت وازی لێهێنایتو ناشـــزانیت هۆکارەکـــەی چییـــە! یابراکەت داوای لێکردیت بۆ هەمیشە وازی لێبهێنیتو نەتبینێتەوە؟

ڕەنگـــە کێشـــەی لەمانـــە گەورەتـــر ڕووبـــەڕووت بووبێتـــەوەو وای لێکردبیـــت چووبیتـــەوە قاوغەکـــەی خۆتو بـــە تەنیا بـــە بەدبەختیو داماوی ژیـــان بگوزەرێنیت، ســـەرت قاڵو دڵت شـــکاو، بە جۆرێك هەست بکەیت ئەو کێشـــەیەی ڕووبـــەڕووت بۆتەوە لەســـەرو توانـــای خۆتەوەیـــە، واهەســـت دەکەیـــت دەرگاکانی بەردەمت داخراون، وای دەبینیت پەنجـــەرەی هەلەکانت لێداخراوەو دەروازەکانی بەختەوەریت بەڕوودا داخراوە، تـــۆش لـــە بارێکدایـــت بەزەییت بـــە خۆتدا دێتـــەوەو دۆش داماویت، بگرە ڕەنگە چۆکت دادابێتو بپرسیت ئایا ڕێگەیەکی ڕزگاربوون ماوە؟

دەکرێت ژیانمان جیاواز بێت، ئەگەر بە وریاییو داناییەوە ڕووبەڕووی کێشـــەکانمان ببینـــەوە، گەر ئامانجمـــان دانابێتو بزانین مەبەســـتەکانمان چییە؟ گـــەر بۆ ئایندەمان نەخشەمان دانا، بەپێی گرنگیان یەکەمینەکانی ژیانمان دیاریکرد. بێگومان هەرگیز ناتوانین کێشەکانمان چارەسەربکەین، گەر ڕووبەڕووی ترســـەکانمان نەبینـــەوەو بـــە تەواوەتی لە لاوازییەکانمانـــدا شـــارەزانەبین، دەبێـــت شارەزای ستراتیژییەتی خۆت بیت، بۆئەوەی زاڵبیت بەسەر ڕێگرییەکاندا، ئەوەی پاڵپشتی ئەمەش دەکات بیرکردنەوەیە لە چوارچێوەی ئەرێنیداو بیرکردنەوە لە باشترین چارەسەر. ئـــەو چوارچێوەیەی کە ئێمە کێشـــەکانمانی تێدەخەیـــنو لە ڕێیـــەوە دەبزوێینو لە ژێر ڕۆشـــنایی ئەویشـــدا کاردانەوەمـــان دەبێت، هـــەر ئەمەش چارەنووســـمان دیاری دەکاتو بڕیارەکانمان دروست دەکات، جا درك کردنی ئەرێنی لە بەرامبەر کێشـــەکانماندا وادەکات ئـــەو کێشـــەیە بەجۆرێـــك ببینیـــن بەوەی ڕێگرییەکە ناتوانین تێیپەڕێنین. لەبەرئەوە زۆر گرنگـــە بچینە قووڵاییـــەوەو لە ناخەوە خۆمان ڕێکبخەینەوەو بیرێکی نوێ دروســـت بکەین کـــە لەگەڵ زاتماندا هاوئاهەنگ بێت، بۆئەوەی ئاشـــتی ناوەکی بەدەســـت بهێنینو بە چاوێکی پڕ لەگـــەش بینییەوە بڕوانینە ســـتراتیژییەتییەکانمان، چونکە ئەوە وزەی داگیرســـێنەری حەماســـەتمانە، خۆراکـــە بۆ گەرمی خۆشەویســـتیمان، تموحمان زیندوو دەکاتەوە تا بمانگەیەنێتە ئامانجەکانمان.

ئایـــا کاتـــی ئـــەوە نییە ســـتراتیژیەتی ژیانمان دابنێین؟

ئایاکاتـــی ئـــەوە نەهاتـــووە بەرامبـــەر ژیانمان بەرپرسیاربینو سەرەداوەکانی ژینی خۆمان بگرینە دەست؟

ئایـــا کاتـــی ئـــەوە نەهاتـــووە خۆمـــان بگۆڕینو ئـــەو بیرە نەرێنییـــەی بەرامبەر

خۆمان هەمانە پێچەوانەی بکەینەوە؟

ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە رووبەرووی خۆمان ببینەوەو لە بەرامبەر خاڵە لاوازەکانماندا بووەستینەوەو ئەو ماسکەی رووماندا دابنێینو بەشدار بین لە رەورەوەی سەرکەوتنو پێشکەوتندا؟

هەموومان ئاواتمانە بچینە ریزی سەرکەوتووانەوە، بە کەشتی براوەکان بگەینە کەناری ئارامیو لەوانە بین کە بەشدارن لە بیناکردنی ژیارو پێشکەوتندا، پشکیان هەیە لە بڵاوکردنەوەی زانیاریو زانستو رووبەرووبوونەوەی رێگرییەکاندا.

ئێمە پێویستیمان بە بریاردانێکی دروستە، دەبێت ئێستا دەستپێبکەین.. نەك سبەینێ، ئەو کەسە کێیە کە دەیەوێت دوابکەوێت؟

ئەو کەسە کێیە دەوەستێتو نایەوێت بەرەوپێشەوە بروات؟

ئەو کەسە کێیە پەلەیەکە بە دیواری بێدەنگییەوەو نایەوێت بدوێت؟

ئەو کەسە کێیە بەرهەمی پرو زەوی بەپیتو گەشەی ناوێت؟

ئەو کەسە کێیە بەبێ پلان رێدەکاتو لە بیابانی ژیاندا وندەبێت؟

ئەو کەسە کێیە هەڵدێتو ئامادەی رووبەرووبوونەوە نییە؟

ئەو کەسە کێیە لە نێوان چواردیواردا دەژی؟

ئەو کەسە کێیە رازییە بە لەیادچونەوەو دنیاش ئەوی لە یاد کردووە؟

ئایا ئەو کەسە تۆیت یاباشتر وایە، بڵێم تۆ رازیت ئەو جۆرە کەسە بیت؟

دڵنیام دەڵێیت نەخێر، کەوایە بەباشی بابەتی گۆڕانکاری بخوێنەرەوە

*** گۆڕانکاری**

گۆڕان تاکەشتێکە لە دنیادا کە بۆ هەمیشە جێگیرە، هەموومان گۆڕاوین، هەر بەردەوامیش دەبین لەم گۆڕانەدا جا بە خۆمانبزانین، یا نا، ئەمە شتێکە نکوڵی لێناکرێت.. ئەرك نابێت گەر وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەیتەوە؟

- سوپاس، ئایا دەتوانیت پۆشاکی ١٠ساڵ لەمەوبەرت بپۆشیت؟

- ئایا بە هەمان جۆری ٥ ساڵ لەمەوبەر بیردەکەیتەوە، یا لە تەنهاییدا زۆرجار شەرم لە هەندێك رەفتارو وتارت دەکەیتو دەست بە دەمووچاوتەوە دەگریت لە شەرمەزاریدا؟

ئایا حەزەکانی ئەمرۆت هەمان حەزی چەند ساڵێك لەمەوبەرن؟

بەدڵنیاییەوە دەڵێیت، نەخێر، گوێم لێتە، کەواتە تۆ گۆڕاویت، بەڵام ئایا ئەم گۆڕانە بە دەستی خۆت بووەوەو پرۆژەت بۆ داناوە، یا بێئەوەی بەخۆت بزانیت بەو ئاراستانەدا براویت! ئازیزم لەوە دڵنیابە هەموو ئەوانەی دەوروبەرت کاریگەرییان لەسەرت هەیەو بەرەو لای خۆیان کێشت دەکەنو پەلکێشت دەکەن، بەرەوبەدی هاتنی ئامانجی خاوەن ئامانجەکانو سەرخستنی پرۆژە تایبەتییەکانیان، ئەمە راستییەکی بەڵگەنەویستە، لەبەرئەوەی گەر ئامانجت نەبێت لە ژیاندا، ئەوە لە پرۆژەی خاوەن ئامانجەکاندایت، ئایا تۆ ئامادەیت، بەدڵنیاییەوە نەخێر!!

بەراستی دەتەوێت بگۆڕێیت؟ حەز دەکەم ئەو مژدەیەت بدەمێ کە ئێمە ناتوانین بتگۆڕین، بەڵام لە هەموی خۆشتر ئەوەیە دەتوانیت خۆت بگۆڕی بێ هیوا مەبە، ئێستا دەچینە ناو باسەکەوە، خوێنەری بەرێز تاکە کەسێك کە بتوانێت ژیانی تۆ لە ٨٠٪ ئاوەژوو بکاتەوە، تەنیاو تەنیا خۆتی، دەزانی بەچی؟

بە (بریار)ێك بریار، وشەیەکی لاتینییە لە برینەوە هاتووە، واتە وەلانانو برینی هەموو نەرێنی رابردووت لە کاتژمێرێك پێش ئێستاوە دەست پێدەکات، واتە ئەو شریتە ببرەو فرێی بدەو بە بەرنامەیەکی نوێو تازەوە دەست پێبکە دەزانی کەی دەبێت دەست پێبکەیت؟ هەر ئێستا، ئێستا ئێستایە دەزانیت زۆربەی خەڵك نازانن بەراستی چیان لە ژیان دەوێت، لەوانیش خراپتر ئەو کەسانەن دەزانن چییان دەوێت، بەڵام دەستیان خستۆتە ژێر چەناگەیانو هیچ ناکەن، ئەمانە تەنیا دانیشتوونو هیوادارن ئەو رۆژە بێت کە هەموو شتێکیان دەستکەوێت، دەزانن ئەو رۆژە کەیە؟ بەڵێ بەدڵنیاییەوە دەزانن ئەو رۆژە (ئەمرۆیە)، کە دەست پێبکەیتو قۆڵی لێهەڵماڵیت، ناهەرگیز نەڵێیت کات نەماوەو تەمەنت هەرچەند بێتو کارت هەرچی بێتو لە هەر رەگەزێك بیت، لە هەر نیشتمانێکدا بیت، لە هەر بارودۆخێکدابیت، کات ماوەو بواریش هەیە، وەك پێشتر ئاماژەم پێدا، تەنیا خۆتی بریاردەری ئەو گۆڕانە بنەڕەتییەی، چونکە (شەقامی رۆژێك) دەتگەیەنێتە کوێرە رێ، بەدڵنیاییەوە تۆش ناتەوێت توشی کوێرە رێ بیت، کەواتە رەفتاری خۆتان بگۆڕنو دەستبەکاربن، بریاربدەن. مەترسن بریاربدەن، گەورەترین داوی سەر رێگای سەرکەوتن ترسە، ترس لە نشوستی، ترس لە سەرکەوتن، ترس لە دەرکردن، ترس لە ئێشو ئازارو لە هەموو نەناسراوێك، کەوایە ئێستا دەزانیت کە گرنگە ترس کەم بکەینەوە؟ تەنیا رێگاش بۆ لە ناوبردنی ترس، رووبەرووبونەوەیەتی، گەر سێبەری ترست لەسەرە برۆرە سەرسەریو پەلاماری بدە.

# کۆتا واژۆ



ن: مارینۆ ئۆتاڵدۆ
و.لە فارسیەوە: ئاراز کامیل

کەس نەیدەزانی «بیلی» بۆ وا کتوپڕ بریاری دا لە «ئیلیزا» جیابێتەوە؟ بەڵام خۆی -کە پیاوێکی دەوڵەمەند بوو- بەڵگەیەکی بەهێزی هەبوو بۆ ئەمە (ئیلیزا تەنها لەبەر سامانەکەم بووە بە هاوسەری من...)!

بەمشێوەیە کارگەیشتە جیابوونەوە، بەڵام لە دادگادا«ئیلیزا» نەك هەر ئەو ئۆتۆمبێلەی کە هاوسەرەکەی لە ساڵیادی هاوسەرگیریاندا خەڵاتی کردبوو، گەڕاندەوە، بەڵکو زێرو خشڵەکانی رۆژی بووکێنیشی دایەوەو وتی: (ئەمانە ئیتر هی من نین... من ئەمانەم بە تۆوە گەرەك بوو...)) کە تۆم نەبێت، خشڵ و سامان بۆ من چ مانایەکی هەیە؟!

بەم وتەیە «بیلی» خێرا تێگەیشت کە چ هەڵەیەکی کردووە، بۆیە واژۆی کۆتایی لەسەر نووسراوی جیابوونەوەکە نەکردو لەگەڵ «ئیلیزا» گەڕانەوە ماڵ.



# ژیان جێگای سەرسامی نییە

سپێدە هۆرمزیار

ژیان جێگای سەرسامی نییە، بەڵکو ئەوە مرۆڤەکانن بە بەرجەستەکردنی هەندێ ڕەفتار لە دواجاردا خودی خۆیانو دەوروبەریش توشی سەرسامی دەکەن. مایەی سەرسوڕمانە کاتێك هەمووان بەرژەوەندی خۆیان دەزانن، کەچی ملی ئەو ڕێگەیە دەگرنەبەر کە ئەهریمەنەکانی ژیان بۆ لە ناوبردنی ئەوان خۆیان مەڵاس داوە.

هاوڕێیەکم دەیگوت من بەڕێژەی لە ١٠٠٪ دڵنیام کە خواردنی پیاز چەندە بۆ تەندروستیم بە کەڵکە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵی خواردنی نادەم. زۆرێك لەخەڵکیش گومانێك لە دڵیان شك نابەی سەبارەت بە باشیو چاکی ئەنجامدانی نوێژەکان، بۆ لایەنی تەندروستی جەستەو دەروونیان، لە هەمان کاتیشدا بۆقیامەتو دوارۆژیان، لە پاڵ ئەمەشدا جڵەوی نەفسیان لە دەستی ئارەزووەکانیاندایە، ئیتر هێزێك بەدی ناکەی تائەوەی کە عەقڵیان بکەن بە سەرداری ژیانیان، کەوابێ هەمووان بە بەرژەوەندی خۆیان ئاشنان، بەڵام مەرج نییە پەیوەندییەکی توندوتۆڵی لەگەڵ هەبێت. کاتێك باس لە خۆڕاگری دەکرێت، هەمووان ئاهی خۆزگەیان تا ئەوپەڕی ئاسمان دەڕوات ئارەزوو دەکەن کە درەختی ئارامگری لە ناخیان پەلو پۆبکات، بەردەوام وتەی بیرمەندەکان دەکەن بە ویردی سەر زوبانیان، کە دەربارەی ئارامیو خۆڕاگری وتراون. بەڵام لە ساتی کەوتنە نێو چاڵی کێشەکان، ئیتر هەر ئەو کەسانە تواناو هێزێك لە ناخیان بەدی ناکەن تائەوەی کە پلیکانەی خۆڕاگری دروست بکەنو بە سەریدا سەرکەونو چاویان ڕۆشن بکەن، بە بینینی خۆری درەوشاوەی ئارامگری، ئەمە نەریتێکە کە هەموو لایەك بێ ویستی خۆیان لە ژیانیان بەرجەستەی دەکەن، ئەوەی کە زیاتر جێگای سەرسوڕمانە دەبێ گشت لایەك بەهەرشێوەیەك بێت ناڕەحەتییەکان تێپەڕێنن، ئیتر ئارامبگرن، یان ئەوەی کە گلەیی لە چارەنووسی خۆیان بکەن، گەر دەزانن بەهەر شێوەیەك کە هەیە دەبێت لەگەڵ کێشەکان ڕووبەڕووببنەوە هیچ ڕێگەیەك نییە بۆ دەربازبوون ئایا ئارام دەگرن؟

یان گەر بەزووبانیشتان نەبێت دەنگی دڵتان هاواری ڕازی نەبوونو بێ ئۆقرەیی دەکات؟ ئەمە پرسیارێکە گەر بیخەینە ڕیزبەندی ڕاپرسییەوە دەگمەنن ئەوانەی دەنگ دەدەن بەوەی کە بەشێوازێکی جوان ئارامگرییان نواندبێت، حەق بە ئێوەیە گەر پرسیاری ئەوە بکەن مەگەر بۆ ئارامی جوانو ناشیرین بوونیان هەیە؟جگە لە وتنی بەڵێ هیچ وشەیەکی تر وەڵامی پرسیاری ئێوە ناداتەوە، یەعقوب پەیامبەر سەلامی خودای لێبێ بۆ دووری یوسفی نازداری دەریای چاوانی بەڕشتنی ئەشك وشکبوونو ئیتر تارمایی بوو بە هاودەمی. لە نیشتیمانی دڵی ئەو هیچ بەهارێك گوزەری نەدەکرد، دڵەی بێنازی دۆزەخ ئاسا بۆ دیداری جگەرگۆشە خۆشەویستەکەی گڕی گرتبوو، هەروەك نالی دەڵێت:

لیباسم ماتەمە شینە لە شیندام
سوروشکم سورە ڕەنگم زەردە بێ تۆ
واتا بە هۆی دووری تۆوە هەرچی
نیشانەی خەمو خەفەتە تیامدا کۆبووەتەوە، جلی شینی تازیەباریم لەبەردایەو خەریکی گریانو شینمو فرمێسکی خوێن لە چاوم ئەڕواو ڕەنگم زەردهەڵگەڕاوە!

سەرەڕایی ئەم زۆری مەینەتیانە خودای گەورە لە سورەتی یوسف سوپاسگوزاری ئەومان بۆ بەیان دەکاتو دەڵێت: بەشێوازێکی زۆرجوان کە خودا پێی ڕازی بێت ئارام دەگرم، هیوام وایە خودای گەورە هەموویانم بۆ بهێنێتەوە، چەندە جوانە ژیان لە نێوان ئاواتو ئارامگریدا، نەوەك خۆزگەو ناسوپاسگوزاری، ئەمە گەواهی ئەوە دەدات کە ئەو کاتە دەتوانن بڵێن: ئارامگری، خۆڕاگرییەکی جوان کە بە وێنەی شەم بسوتێن لە نێو جەنگەڵستانی ناڕەحەتییەکانی ژیان، بەڵام بێ ڕێزی نەنوێنن بەرامبەر فەرمانەکانی خودایی گەورە کە بۆچی چارەنوستانی بەم ڕۆژە گەیاند، دڵنیابن لە کۆتاییدا چاوتان ڕۆشن دەبێت بە دیداری یوسفەکانتان، ئەوانەی بە زوبانیان لافی ئەوە لێدەدەن ئارامگرنو لە ناخەوە مرۆڤانێکی ڕووخاون، چونکە گومان دەکەن بەدبەختن تەنانەت هەتاوی ڕقو قینی خوداش لە ئەوان ماڵئاوایی ناکات، ئەوانە ئەو کەسانەن کە ئیتر زستانی ئارامگرتنیان بە کۆتا نایەتو هیچ بەهارێکی کامەرانی بۆ ژووان کردن لەگەڵ ئەوان خۆی ئامادەناکات، چوون تەنها ئەوانە چانسی ئەوەیان هەیە کە چێژ لە ژیان وەربگرن، کە لە ڕاستییەکان ورد دەبنەوە، تەنها نیگایان بۆ جوانی درەختەکان ناڕوات، بەڵکو لە دواجاردا سەرنج دەدەنە ڕەگەکانو نهێنی بوونیان لە ژێر زەوی..

# تەمەنی ڕاستەقینەی خۆت بدۆزەرەوە!



## ئایا منداڵێکی پاكو بێگەردی، یاخود لاوێکی تازە پێگەیشتووی، یان کەسێکی بەساڵاچووی؟!

دیارییکردنی تەمەن بە پێی ڕۆژو مانگ و ساڵ نییە، زۆرجار دەبینین کەسێك تەمەنێکی کەمی هەیە، بەڵام بە ڕووخساردا لە کەسێکی بەساڵاچوو دەچێت، بە پێچەوانەشەوە، کەسانێکی دیکە هەن دەیان ساڵ ژیاون، بەڵام گەر لێیان بپرسین، دەڵێن: تەنها چەند ساڵێکی کەم چێژمان لە ژیان بینیوە، تەمەنی پێشومان بە فێڕۆچووە، ئەمەش زۆر ڕاستە..

ئێستا با بە پێی ئەم هەڵسەنگاندنە تەمەنی خۆمان دیاری بکەین:

١- ئایا خەون بە ماڵێکی قەشەنگو ڕازاوەوە دەبینیت، کە بە تەنها تیایدا ژیان بگوزەرێنیت؟

أ- نەخێر. ب- هەندێجار. ج- بەڵێ.

٢- ئایا هەست دەکەیت کە ژیان زۆر جوانو خۆشە، سەرەڕای هەموو پاڵەپەستۆو ناخۆشییەکانی؟

أ- نەخێر. ب- هەندێجار. ج- بەڵێ.

٣- ئایا حەز دەکەیت هەمیشە هاوڕێیەتی کەسانێك بکەیت کە تەمەنیان لە خۆت بچووکترە؟

أ- نەخێر. ب- هەندێجار. ج- بەڵێ.

٤- ئایا هەمیشە بیر لە یادەوەرییە خۆشەکانی ژیانت دەکەیتەوە؟

أ- نەخێر. ب- هەندێجار. ج- بەڵێ.

٥- ئایا بە بۆچونی تۆ، ژیان لە چەند ڕۆژێکی دیاریکراو پێکهاتووەو پاشان گوزەر دەکاتو کۆتایی دێت؟

أ- نەخێر. ب- هەندێجار. ج- بەڵێ.

٦- ئایا حەز بە چیرۆکی پڕ لە سۆزو خۆشەویستیو فیلمی ڕۆمانسی دەکەیت؟

أ- نەخێر. ب- هەندێجار. ج- بەڵێ.

٧- ئایا لە بەرەو پێشچوونی تەمەنو نارەحەتیو پێشهاتەکانی ژیان دەترسیت؟

أ- نەخێر. ب- هەندێجار. ج- بەڵێ.

٨- ئایا لەو باوەڕەدایت کە تەمەنت گەیشتە ٦٠ ساڵ، توانای دەربڕینی سۆزو خۆشەویستیت هەبێت بۆ بەرامبەرەکەت؟

أ- نەخێر. ب- هەندێجار. ج- بەڵێ.

٩- ئایا لەو باوەڕەدایت کە مرۆڤ دەتوانێت لە هەموو قۆناغەکانی تەمەندا تامو چێژ لە ژیان وەربگرێت؟

أ- نەخێر. ب- هەندێجار. ج- بەڵێ.

١٠- ئایا لەو باوەڕەدایت کە زۆری تەمەن، شارەزاییو لێهاتوویی مرۆڤ زیاد دەکات؟

أ- نەخێر. ب- هەندێجار. ج- بەڵێ.

ئەنجام: بۆ زانینی ئەنجامەکەت، یەك نمرە بۆ خاڵی (أ) دابنێ، دوو نمرە بۆ خاڵی (ب)، ٣ نمرە بۆ خاڵی (ج):

* ئەگەر ئەو نمرانەی بە دەستت هێناوە لە نێوان (١٠-١٥)نمرە بوو، مانای ئەوەیە کە تۆ هەستێکی منداڵانەو ڕوونو عەفەویت هەیە، پەرچەکردارەکانت بەریئانەیە، هەروەها خاوەنی دڵێکی پاکیت، نازانیت ڕقو کینە چییە، هەمیشە تۆ کەمتر لە تەمەنی خۆت دەردەکەویت، لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە دڵخۆشو سینەفراوانیو حەز لە ژیان دەکەیت، هیواو ئاواتت هەیە، بە گەشبینییەوە بۆ ئاییندە دەڕوانیت، بەڵام گاڵتەت بە زۆرێك لە کارە گرنگو چارەنووسسازەکان دێت، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی زۆرێك لە هەلەکانی ژیانت لە دەستبچێت.

* ئەگەر ئەو نمرانەی بە دەستت هێناوە لە نێوان (١٦-٢٢) نمرەدا بێت: ئەوە مانای ئەوەیە کە تۆ مرۆڤێکی ژیری، تێگەیشتویت، پتەوو تۆکمەو دامەزراویت، خەون بە ئاییندەیەکی گەشو ئارامەوە دەبینیت، هەموو تەمەنت چێژ لە ژیان دەبینیت، بە شێوەیەك کە هاوبیرو هاوئاهەنگی لەگەڵ هەموو قۆناغەکانی تەمەندا، دەرکەوتنی تەمەنی ڕاستەقینەی تۆ، هاوکاتە لەگەڵ شێوەو ڕووخسارت.

* ئەگەر ئەو نمرانەی بە دەستت هێناوە لە نێوان (٢٣ - ٣٠) نمرەدا بێت: ئەوا تۆ بیر لە تەمەنی پیریو نیشانەکانی دەکەیتەوە، زۆرێك لە تەمەنت بە فیڕۆ داوە، هەمیشە کارەکان لە خۆت قورسو ئاڵۆز دەکەیت، لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە حەز بە کۆڕو دانیشتنی بە ساڵاچووان دەکەیت، ئارەزوو ناکەیت لەگەڵ هاوتەمەنەکانی خۆتدا ژیان بگوزەرێنیت، تەمەنی لاوێتیو گەنجی خۆت بە فیڕۆداوە، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا تۆ کەسێکی ڕەشبینیو دەڕوانیت بۆ نیوە بەتاڵەکەی پەرداخە ئاوەکە، هەمیشە لە کەشێکی خەماویو دڵتەنگیدا ژیان دەگوزەرێنیت، هەموو ئەمانەش دەبنە هۆی دەرکەوتنی شێوەو ڕووخسارت گەورەتر لە تەمەنی خۆت..

چارەسەر ئاسانە دەتوانیت سوود لە کەسانی سەرکەوتوو وەربگریتو بیرۆکە خراپو نەرێنییەکانت بگۆڕیت بە بیرۆکەی جوانو ئەرێنی، تا دەبیتە کەسێکی سەرکەوتوو گەشبین لە ژیاندا.

بەشی چوارەم



# گومانبردن

پەیمان غەمگین

بـۆ زیاتـر قوڵبوونـەوە لـە گومـان، مەبەسـتمانە، خاڵێـك بدۆزینـەوە بـۆ ڕزگاربـوون لـەو گیرۆدەییـە، کـە مـن بە نەخۆشـییەکی کوشـندەی دەزانم لـە نێوان تاکەکاندا. ئەوانەی باسمان کردو ئەوانەی کە باسیشیان دەکەین، هەموویان ڕوونکردنەوەی زانستیو بیروباوەڕن، بۆ گەیشتن بە خاڵێکی جێگیر، لەوێشەوە بۆ هەڵدانەوەی ئەو پەردە تارەی کـە بەرچاومانی گرتـووە، لە بینینی واقیعێکـی ڕەخسـاو لەوەرچەرخان بوونێکی ونەوە، کـە نەمانتوانیوە هەسـتی پێبکەین. گیرۆدەبوون بـە وەختایەکی زۆرەوە، لەگەڵ بەسـەرهاتەکانی یەك لە دوای یەکی زەمەن، وایکـردووە سـنورەکانی گومـان، لەوپـەڕی فراوانییـەوە ببینرێـت، بە بـەراورد لەگەڵ سنورەکانی بەرگریبوونو گەیشتن بە بڕیارێکی یەکلاکـەرەوە، لەبەرامبەر گومانەکان. ئەوەی چنگمان کەوت لە بەشـەکانی تر، باسگەلێکی زۆرجیاوازتربـوون، لـەوەی کـە دەمانەوێت بیانوروژێنین، بەڵام ئەم باسانەشمان هەر بە تەواوکەری مانشێتەکە دەمێنێتەوە.

وەك باسـمان کرد، هەست وروژێنەرێکی سـەرەکی زاوزێـی وەچەکانـی گومانە، بەڵام ژینگەی بەرجەسـتە بـووی مرۆڤیش، دوور لەو هەستە نابەرجەستەیانە، ڕۆڵێکی باڵایان هەیـە، لـەم ڕێگایەوە دەتوانـم بڵێم؛ گومان کارابوونی خـۆی دۆزیوەتەوە، لە نێو هەموو پرۆسـە فیکریەکان، چونکە ئەگەر دووریش بکەوینـەوە، لـەو پرۆسـە هزریانـەی کـە بەرجەستە نابن لە ژینگەیەکی بەرجەستەبوو، دەبێـت دووبارە تێکەڵی ئـەو ژینگەیە ببین کـە خۆمان بە بەرجەسـتە بوو لـە نێویدا دەخولێینـەوە، بێئـەوەی بتوانین ڕەخنە لە بەرجەستەبوونی هیچ گومانێك بگرین. ئەمە وەك لێکدانەوەیەکی مەیدانی ببینە.

ڕێگەبگـرە بـەرو بـڕۆ بـۆ لای چەنـد کەسـێك، لەوانە با هەندێکیـان خێزانداربن، هەندێکیشیان سەڵت، هەندێکیشیان با منداڵی ١٠ ساڵانەبن، هەریەك لەمانە شتێکی تایبەت بە خۆیان هەیە، بۆ بینینو بیستنو تامکردنو بۆنکردنو دەسـتلێدان، واتا بەشێوەیەکی تر، هەریەکەیـان بـە پێی بیرکردنـەوەی خۆی لێکدانـەوەی بـۆ هەسـتەکانی خـۆی هەیە، سـا نزیکە هاوتەمەنـەکان لێکدانەوەکانیان لەیەکبچێـت، یاخود خێزاندارەکان بە هەمان شـێوە، بەڵام هەرگیز ڕوونادات خێزاندارێك هەمـان لێکدانـەوەی گەنجێکی هـەرزەکاری هەبێـت، هەرگیزیـش منداڵێکـی ١٠سـاڵان لێکدانەوەکانـی وەك پیرەپیاوێـك نابێت بۆ هەستەکانی، چونکە هەریەکەیان ژینگەیەکی بەرجەستەبووی تایبەت بەخۆیان هەیە، کە لە ڕێگای ئەو پێنج ئامرازە هەسـتیارەی باسمان کرد لێکدانەوە بۆ هەستەکانیان دەکەن.

با ئێسـتا توێژینەوەکە چڕ بکەینەوە، لە خێزاندارەکە دەپرسـین؛ ئایا چیت هەیە بۆ گومـان؟ ئەو لە وەڵامدا وەك گەنجێك نایەتە گۆ، کە سەیری بەرپێی قسەکانی نەکات، بەڵکو بە هەسـتەوە دەچێتە نێو باسـەکە، ئەمیش بە هۆی ئەوەی گومان بەشـێکە لە خۆی، لە ڕێگای ئەو پاڵەپەسـتۆیەی کە لەسـەریەتی. وەك ئەوەی کەسێك کە ژن دەهێنێت، هەموو خەڵکی بە چاوێکی دیکە سـەیری دەکەن، لە کاتێکدا ئەم هەر کەسەکەی پێشووە کە بێ ژن بوو، هۆکاری ئەمە ئەو بەرپرسیاربوونەیە کە دروسـت دەبێت، بەسـەر هەرتاکێك لە کاتی زەماوەندکردن، ئەگـەر وردبینەوە دەبینین، زۆربەـەی کێشـە خێزانییـەکان بـە هـۆی حاڵـی نەبوونە، خۆی خاڵـی حاڵی نەبوونو تێنەگەیشـتنیش هۆکارەکـەی گوێنەگرتـنو دایەلۆگـە، هـۆکاری نەبوونـی دایەلۆگیش، هەسـتی خۆ فەرزکردنـە بەسـەر یەکتردا، ئەم هەستەش لە بەرپرسیاربوونەوە دروست دەبێت، بەرپرسـیاریەتیش ئەرکێکی قورسە بـۆ هەریەکێکمان، سـابەو هۆیەش لە یەکەم هەنگاوی خراپ لێکدانەوەی ئەو بەرپرسیارییە گومان دروست دەبێتو سەر هەڵدەدا.

بۆیە لێکدانەوەی ئەو خاوەن خێزانە، زیاتر لێکدانەوەیەکی بەرپرسیاربوونە لە پانتاییەکی ون، گومانی ئەو کەسـە لە هەڵسوکەوتەکانی زیاتر شـاراوەیە، بەڵام لـە کەمترین جوڵەی نامۆی ژنەکەی دەکۆڵێتەوە، باهەرچەندێکیش متمانەی لەسـەر بێت، ئەمە دەگەڕێتەوە سەر ئەو بەرپرسیاریەی کە لەسەریەتیو ناتوانێت بە تەواوی لە بارەیەوە تێبگات.




ئەو کەسە بەجێ دەهێڵین، دەچین لەگەڵ ئەو گەنجە تازە پێگەیشتووە قسەدەکەینو هەمان پرسیاری لێدەکەین، ئایا جیت هەیە بۆ گومان؟ ئەمیش وەڵامێکی تایبەتی هەیە، ئەو زۆر جیاواز لەگەڵ خاوەن خێزانەکە پێناس دەکرێت، چونکە با نەشارەزایی هەنگاو دەنێتە نێو باسەکەوە، دووراودوور بڕیاردەدات، وەك ئەوەی هەمان ئەرکی خاوەن خێزانەکەی لە کۆڵ بێت، دێتە گۆ، بەڵام لێکدانەوەکانی زۆرجیاوازترە بۆ وەڵامی پرسیارەکەمان، بەهۆی ئەوەی لە ڕوانگەی متمانەی هەستەکانییەوە دەچێتە نێو گفتوگۆکە، ڕەچاوی ئەوەناکات کە هەستەکانی چەندە تینوبوون لە ڕاستییەکان، بۆیە دیسان لە نێو لێکدانەوەکانی توشی هەمان گومان دەبێت، کە دەیەوێت بیوروژێنێت، بۆ نموونە دەیەوێت باسی هەستی خۆی بکات، بۆ ئەو وشەیە لە هەمان کات گومانی هەیە، ئاخۆ هەستەکەی ڕاستگۆیانە دەدوێت، یان نا. ئەو بە ڕەچاوکردنی تەمەنی خۆی، لە سنوری خۆیەوە نیشتیمانێکی تازە دەخولقێنێ بۆ باسەکەی، دەچێتە سەر خاڵێکی زەق، وەك کارەکتەر ڕۆڵی نهێنییەك دەگێڕێ، ئەو لە درێژکردنەوەکانی باسی خۆی سەبارەت بە گومان، هێرش دەکاتە سەر دژە ڕەگەزەکەی، بە دڵنیاییەوە نزیکە گومان بە شتێکی ڕاست بزانێت، کەچی لە دڵەوەش هەست بەوە دەکات خەریکی ئەوەیە هێرشێك بەرپا بکات، بۆ سەر ویژدانی کەسانی تر. لەو ڕێگەیەوە ئەو بەردەوام دەبێت لە هێرشەکەی، تادەگات بەوەی خۆی ببێتە دەروازەیەك بۆ ڕاستییەکان، ئەمیش لە حاڵەتێکدا کە دان بەوەدادەنێت، گومانبردن پێویستی بەلێکدانەوە هەیە، نزیکە دژە ڕەگەزەکەی، کەسێکی جێگای گومان بووبێت، بۆیە ئەو گومانی بە پۆزەتیف نەخشاند بێت، بەڵام هێشتانیش کەسێکی گوماناوییە، چونکە هەوڵی نەداوە لە ڕاستییەکان بگات.

گومان وەك مۆرانە وایە هەرچەندێك بیهێڵیتەوە زیاتر ناخت دەخوات، بۆیە دەبێت بە زوویی پشتڕاستی بکەیتەوە، ئاخۆ لە کوێدا هەڵەی.

ئێستا با بچینە لای منداڵێکی ١٠ساڵان، ئەو بە هۆی ئەوەی ناتوانێت بە جوانی وشەکە شیبکاتەوە، ئێمە بۆی ئاسان دەکەین دەڵێین، بچکۆل ئەگەر تۆپی یاری کردنەکەت بزربێت، لە کوێ بۆی دەگەڕێیت؟ ئایا گومان لە کێ دەکەیت بردبێتی؟ ئەو بە هۆی ئەوەی لێکدانەوەیەکی خێرای نییە، ناشتوانێت بە فراوانی بیربکاتەوە، بەکراست دەڵێت: لەو منداڵەی دراوسێمان، ئەوە هۆکارەکەی ئەوەیە کە تەنها ئەو منداڵە بە جوانی دەناسێت، هەر بۆیە بیری بۆ ئەو دەڕوات!

**ژیان فێری کردم:** هەموو گورگێك دوژمن نییە، هەموو چۆلەکەیەك هاوڕێ نییە، هەموو کەروێشکێك ماڵی نییە، هەموو شێرێك دڕندە نییە.

**ژیان فێری کردم:** هەموو منداڵێك پاكو بێگەرد نییە، هەموو ڕێوییەك فێڵباز نییە، هەموو دووپشکێك کوشندە نییە، هەموو سەگێکیش بەوەفا نییە، هەموو پشیلەیەکیش سپڵە نییە!

**ژیان فێری کردم:** هەموو شتێك کۆتایی هەیە، هەروەکو چۆن هەموو شتێك سەرەتایەکی هەیە.

**ژیان فێری کردم:** بە نرخترین شت کە ئێستا خاوەنین، بێگومان سبەینێ لە دەستمان دەچێت.

**ژیان فێری کردم:** نهێنییەکانت کۆتو بەندی تۆن، ئاگاداربە لای هیچ کەس نەیاندرکێنیت، چونکە تۆ دەبیتە دیلو بەندی ئەوان.

**ژیان فێری کردم:** زۆر ئاسانە کەسێکمان خۆشبووێت، بەڵام زۆر گرانە بتوانین کەسێك بدۆزینەوە شایستەی خۆشەویستیمان بێت.

**ژیان فێری کردم:** کە ئارام بگرم لەسەر برینو ئازاری خۆشەویستانم، بەڵام فێرنەبووم کە بزانم چۆن سارێژی برینەکانیان بکەم.

**ژیان فێری کردم:** گلەییو گازندە لە هاوڕێکانم بکەم، بەڵام نازانم کێ شایستەی ئەوەیە ببێتە هاوڕێم.

**ژیان فێری کردم:** کە فرمێسکی دۆستانم بسڕم، بەڵام نازانم چۆن فرمێسکەکانی خۆم بسڕم.

**ژیان فێری کردم:** نەگریم بۆ ژیانێك کە دەبێت لە کۆتاییدا جێی بهێڵین.

**ژیان فێری کردم:** هەموو شتێك لە گەردوونو زەویدا سنورێکی هەیە.

**ژیان فێری کردم:** کە زەردەخەنە بکەم بە ڕووی ئەو کەسانەدا کە گرژو مۆنن، بۆئەوەی فێربن کە چۆن زەردەخەنە بکەن.

**ژیان فێری کردم:** شکست بریتییە لە سەرەتای ئەزموون، بۆ تەیکردنو شەقکردنی ڕێگەی سەرکەوتن.

**ژیان فێری کردم:** بیر لە ڕابردوو نەکەمەوە، چونکە ڕابردوو تێپەڕیوەو هەرگیز ناگەڕێتەوە، فێربووم بۆ سبەینێ بڕوانم، چونکە پڕە لە ئاواتو هیواو گەشبینیو ئایندەیەکی پرشنگدار.

**ژیان فێری کردم:** خەڵکی بە ژیاندا گوزەر دەکەن، هەندێکیان حەز دەکەن بگەڕێنەوە بۆ ڕابردوو، هەندێکیشیان حەزدەکەن دنیا جێبهێڵن..

**ژیان فێری کردم:** کە دووربکەومەوە لە گومانو ئیرەیی بردن، چونکە بنەمای تێکدانو لەناوچوونی ژیانو بەختەوەرین!

**ژیان فێری کردم:** لەگەڵ کەسانی نەفام وتوێژ نەکەم، چونکە پەشیمان دەبمەوە، هەروەها لەگەڵ کەسانی نەزانیشدا وتوێژ نەکەم، چونکە ماندوو دەبم، لەگەڵ درۆزنیشدا هاوڕێیەتی نەکەم، چونکە ئەدۆڕێم.

ئا: محەممەد عیزەت عەبدولقادر



# هەمیشە پێبکەنە

مرۆڤ کاتێك پێدەکەنێت کە بیەوێت گوزارشت لە هەستی خۆی بکات، یاخود بۆ دەربڕینی خۆشییەکانی، مرۆڤ بەردەوام هەوڵدەدات پارێزگاری لە تەندروستی خۆی بکات، بۆ ئەم مەبەستە چەندین ڕێگەی جیاواز دەگرێتە بەر، وەکو: (وەرزشکردنی بەردەوام، یاخود ڕێکخستنی سیستەمی خۆراك ... هتد)، بەڵام ئاسانترین ڕێگە بۆ پاراستنی تەندروستیت، پێکەنینو زەردەخەنەیە.

چەندین هۆکاری جیاواز هەیە کە دەبێتە هۆی ئەوەی بمانخاتە پێکەنین، لەوانە کاتێك تەماشای فیلمێکی کۆمیدی، یاخود ئەفلام کارتۆنێك، یاخود گوێبیستی نوکتەیەك، یان قسەیەکی خۆش دەبینو زۆرجاریش ڕووداوەکانی دەوروبەرمان دەمانخاتە پێکەنین، هەندێجار بە بیرکردنەوە لە ڕووداوەکانی ڕابردوو پێدەکەنین، لە زۆرێك لە نەخۆشخانە دەروونییەکاندا یەکێك لە چارەسەرە بنەڕەتییەکان پێکەنینەو هەر پێکەنینیشە دەتوانێت زۆر بە ئاسانی فشارە دەروونییەکان کەمبکاتەوە.

پێکەنین یارمەتیمان دەدات بۆئەوەی تەندروست بین، نوێترین لێکۆڵینەوەکان ئەوەیان دەرخستووە کە مرۆڤ پێویستە ڕۆژانە (٧)جار پێبکەنێت، جا پێکەنینەکە ئەگەر تەنها بە زەردەخەنەیەکیش بێت، هەروەها ئەوەشیان دەرخستووە کە پێکەنین یارمەتیمان دەدات بۆ بەرەنگاربوونەوەی چەندین نەخۆشی، لەگەڵ ئەوەشدا پێکەنین یارمەتیدەرێکی زۆرباشە بۆ پاراستنی باری ژیری، دەڵێن: کاتێك مرۆڤ پێدەکەنێت (٢١٠) ماسولکە لەم کارەدا بەشدار دەبێت، ئەمەش زۆر بەسوودە بۆ ڕێکخستنو چارەسەرکردنی کێشەکانی ماسولکەکان، لە توێژینەوەیەکی تردا ئەوە دەرکەوتووە کە پێکەنین یارمەتی مرۆڤ دەداتو کرداری هەناسە ئاسان دەکاتو یارمەتی ڕێکخستنی سوڕی خوێن دەدات، ئەمەش سوودمان پێدەگەیەنێت بۆ ڕێکخستنی فەرمانەکانی لەش، پێویستە ئەوەش بزانین کە پێکەنین یارمەتی کۆئەندامی دەمار دەدات.

پزیشکەکان ئەوەیان بۆدەرکەتووە ئەو کەسانەی هەمیشە ڕووخۆشو لێو بە خەندەن، کەمتر تووشی جەڵتەی دڵو دەماغ دەبن، بە بەراورد لەو کەسانەی کە توڕەن، تووشبوونیان بەم نەخۆشییە مەترسیدارە زۆر زیاترە، دەتوانین بە پێکەنین ئاستی کۆلیسترۆڵ دابەزێنینو کەمی بکەینەوە بۆئەوەی تووشی فشارە دەروونییەکان نەبین.

(فیرادروسیون) کە توێژەرەوەیەکی ئەمریکییە لە توێژینەوەیەکیدا سەبارەت بە پێکەنین بۆی دەرکەوت کە پێکەنین بە شێوەی قاقا لێدانی دڵ زیاد دەکاتو لە کاتی ئەم پێکەنینەشدا هەست بە خێرایی لە هەناسەکانماندا دەکەین، کە ئەمەش دەبێتە هۆی ڕێکخستنی سوڕی خوێنو ڕزگاربوون لە خەمۆکیو نەخۆشییە دەرونییەکان.

مرۆڤ ئەگەر بیەوێت کەسێکی بە توانا بێت لە کارەکانیداو سەرکەوتوو بێت، پێویستە هەمیشە ڕووبەخەندە بێت، هەر پێکەنینیشە دەبێتە هۆی بڕوابەخۆبوونی زیاتر کە ئەمەش یارمەتیمان دەدات کەسێکی بەهێزمان لێدەربچێت، کەسانی پێش خۆمان پێکەنینیان بە چارەسەرێکی باشو هەرزان داناوەو وتویانە (باشترینو هەرزانترین چارەسەر پێکەنینە)و چەندین قسەو چەندین پەندی جیاواز لەسەر پێکەنین وتراوە: (بۆ ژیان پێبکەنە، ژیان بۆت پێدەکەنێت).

لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامیشدا زۆر گرنگی بە ڕووخۆشیو زەردەخەنە دراوە، تەنانەت ڕووخۆشیو لێوبەخەندەیی بە چاکەو خێر دانراوە، پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) فەرموویەتی: (لا تحقرن من المعروف شیئا ولو ان تلقى اخاك بوجه طلق)، واتە هیچ کردەوەیەکی چاکە بە کەم مەزانە، تەنانەت ئەگەر بە ڕوویەکی خۆشو زەردەخەنەوە ڕووبەڕووی براکەت ببیتەوە.

ئەو سەرچاوانەی سوودیان لێ وەرگیراوە:
(زانیاری تایبەت، بانکی زانیاری، چارەسەر بە پێکەنین، پەندی پێشینان، فەرموودەکانی پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت)).



# چۆن هاوڕێکانت دیاری دەکەیت؟

عەبدولمەناف عەبدولعەزیز

هاوڕێ ئەو وشە جوانەیە کە وای لە زۆرێك نوسەرو ڕۆشنبیران کردووە هەریەکە بە جۆرێك پێناسەی بکەنو چەندین بابەتی بە پێزوپوختی لەسەر بنووسن. وای لە چەندین زانا کرد کە چەندین ڕێسای تایبەتی بۆ بدۆزنەوە. بووە بەرهەمی هەزاران چیرۆكو پەندو ئامۆژگاری بۆ مرۆڤایەتی کە دەتوانن سوودی لێوەرگرن، بۆ ئاشنابوونو دۆزینەوەی هاوڕێی ڕاستەقینە.

هاوڕێ ئەو کەسەیە کە دەتوانێت ڕێگای سەرکەوتنی ژیانت پێنیشانداو دەتوانێت گەورەترین یارمەتیدەرت بێ لە کاروبارەکانی ڕۆژانەتو بە شێوازێك بچنە نێو ناخی یەکتر، کە هەست بە هەموو نهێنییە شاراوەکانی یەکتر بکەنو بزانیت کە چ کاتێك دڵتەنگەو چ کاتێك دڵخۆشو ئارامە. بەپێچەوانەشەوە لەوانەیە ببێتە هۆی سەرەتای ونبونی تۆ لە نێو کێشە کۆمەڵایەتیو ئابوورییەکاندا، بە جۆرێك واتلێبێت، بۆ هەمیشە لە نێو پەنجەرەکانی نێو بەندیخانەکان سەیری دیمەنە جوانەکانی ژیانو سرووشت بکەیت.

ئەوەی لای هەموو خەڵك ئاشنایە ئەوەیە کە دەبێت هەمووومان هاوڕێمان هەبێت، چونکە ڕۆژگارەکانی ژیان بە تەنها بەسەر ناچێت، کارە سەختەکانی ژیان بە تەنها جێبەجێ ناکرێت، بەڵام ڕاستییەکی بەڵگە نەویست هەیە کە دەبێت هەمووومان بیروڕامان یەك بێت، بۆئەوەی کە زۆرێك لە خەڵکان سەرکەوتوو نین لە هەڵبژاردنی هاوڕێکانیان!

بەشێوەیەکی سەرەکیش هۆکارەکەی ئەوەیە کە هەڵبژاردنی هاوڕێکانیان لەسەر بنەمایەکی ڕاستو دروست دانەمەزراوە، چونکە بڕیارە هاوڕێ لەسەر بنەمای خۆشەویستیو وەفاداری، تازۆرترین کات پێکەوەبوون لە ساتە خۆشو ناخۆشەکانداو دووبارە دروستکردنەوەو یارمەتیدانی لەو ساتانەی کە ڕووخاوە. وەك وتراوە: (هاوسەرگیری لەگەڵ کەسێکدا بکە کە پلەیەك لە خۆت نزمتر بێت، هاوڕێیەتیش لەگەڵ کەسێکدا دروست بکە، کە پلەیەك لە خۆت بەرزتر بێت).. ئێستا بیربکەرەوە، بۆ دەستنیشانکردنی هاوڕێ پێویستە پشت بە کۆمەڵێ بنەما ببەستیت، ئینجا لە هەر ساتو شوێنێکو قۆناغێکدا بێت کێشە نییە، گرنگترین خاڵ ئەوەیە بە هەموو شێوەیەك هەوڵبدەیت لە ڕووی ژمارەوە کەمترین هاوڕێت هەبێت، تەنانەت ئەگەر یەك هاوڕێش بێت، هیچ کێشە نییە، چونکە دڵنیابە ئەگەر کەسێك هاوڕێی زۆر بوو ئەوا مانای وایە کێشەی زۆرە، لێرەدا مەبەستم ئەوەیە کە بە مانای وشە هاوڕێیەتی بکەیت، چونکە یەکتر ناسین جیاوازە لە هاوڕێیەتی، وەك پەندێکی ئینگیلیزی هەیە دەڵێت: (هاوڕێکانت دەبێت وەك کتێب بخوێنیتەوە، کەم هەڵبژاردەش بە).

خاڵێکی تر ئەوەیە کاتێك بڕیار دەدەیت هاوڕێیەتی کەسێك بکەیت پێویست ناکات چاوەڕێ بکەیت، بەڵکو پێویستە بە زووترین کات کارەکە دەستپێبکەیت، لەم بارەیەوە ڕستەیەکی زۆر جوان هەیە دەڵێت: (سەیرە هەموو بە شوێن هاوڕێییەتیدا دەگەڕێین، هەمووانیش تەنها لە هاوڕێ چاوەڕوانی هاوڕێییەتی دەکەین). کاتێك کە هاوڕێ هەڵدەبژێریت، با لە هەموو بوارێکدا لە تۆ شارەزایی زیاتر بێت، تاکو هەم ببێتە مامۆستایەك، هەمیش هاوڕێت بێت. هەرگیز بەبێ تاقیکردنەوە بڕیاری هاوڕێیەتی مەدە لەگەڵ هیچ کەس، تەنانەت گەر دراوسێت بێت، یان کوڕە خاڵ، یا کوڕە مام، تا ئەو کاتەی لێی دڵنیا نەبیت. هەروەها هەرگیز گوێ لەو قسانە مەگرە کە باسی کەمو کوڕییەکانی هاوڕێکەت دەکەن. خاڵێکی گرنگ هەیە کە پێویستە هەموو تاکێك درکی پێ بکاتو بیزانێتو کاری پێ بکات، ئەویش بریتییە لە لێبوردەیی لە نێوان هاوڕێییەتیدا، من دڵنیام ڕێژەیەکی زۆرمان بایەخمان بەو بابەتە نەداوە، زۆرکات دەبینین دوو هاوڕێ لەسەر بابەتێکی زۆر سادە دەبێتە کێشەیان، سەرەنجام لە یەکتر دووردەکەونەوە، من مەبەستم ئەوە نییە کە هەموو هەڵەیەك قبووڵ بکەیتو لە بەرامبەردا کاردانەوەت نەبێت، بەڵکو مەبەستی من ئەوەیە پێویستە هەلێکی تری پێببەخشین، چونکە گەر ئێمە بڕیاری جیابوونەوەمان دا، ئەوا لە داهاتوودا پێویستە هاوڕێیەکی دیکە بدۆزینەوە بە جێگایی ئەو، ئەوەش کارێکی ئاسان نابێت تاکو بڕیار لەسەر هاوڕێیەکی تر بدەیت، ئەمە جگە لەوەی ڕەنگە تووشی کەسێکی تر بیت کە بە بەراورد لەگەڵ هاوڕێکەی تر زۆر خراپتر بێت، بۆیە هیوام وایە بە شێوەیەکی هەستیار مامەڵە لەگەڵ بارودۆخەکە بکەین. ئەم وتەیە بۆ ئەو بابەتە بەسە (هەموو کات بە گۆڕانکارییەوە سەیری هاوڕێکەت بکە).

بابەتەکە زۆر هەڵدەگرێت، بەڵام دوا وتەم بۆ خوێنەرەکانی ئەم بابەتە ئەوەیە کاتێك بڕیاری هاوڕێیەتیت لەگەڵ کەسێك دا، ئەم پرسیارانە لە خۆت بکە؟ ئایا ئەو یارمەتی گەشەکردنی من دەدات؟ ئایا لە دیدی منەوە کەسێکی چاکو شیاوی ڕێزلێگرتنە؟ ئایا پشتیوانی یەکتر دەبین؟ ئایا بەرژەوەندی هاوبەشمان هەیە؟ ئایا لە چۆنێتی کات بەسەر بردن، یان تەلەفۆن کردن لەگەڵیدا هەست بە شادی دەکەین؟ کاتێك وەڵامی ئەم پرسیارانەت پێگەیشت دەربارەی هاوڕێکەت بڕیاری کۆتایی تەنیا لە دەستی خۆتدایەو ئازادو سەربەستی.

# کێ دایکم لێدەکڕێت؟

ئالانی



لە شەوی زەماوەندیی هاوسەرگیریدا کاکی زاوا لە تەنیشتی بووکەخانەوە دانیشتبوو، بە دڵێکی خۆش‌و ئاسوودەو لەوپەڕی خۆشحاڵیداو بە زەردەخەنەوە بۆ بووکەخانی دەڕوانی، ڕەنگە سەیر نەبێت کاتێك دەبینیت زاوا لەوپەڕی خۆشحاڵیدایە، چونکە ئەمڕۆژە خەونی لە مێژەینەیەتی‌و دیاریکردنی داهاتوویەتی‌و ئەو ساتەوەختەیە کە لە مێژە خەونی پێوە دەبینێت، ئێستا خەوەکەی هاتووەتە دی‌و گەیشتووە بەو کەسەی ئاواتەخواز بوو، ڕۆژێك لە ڕۆژان لە ژێرسێبەری ماڵێکی خنجیلانەدا کۆببنەوە..

ڕوانینەکان لە ناخی دڵەوە بوو، زەردەخەنەو پێکەنینەکان ڕاستەقینەبوون، بەختەوەری‌و خۆشحاڵی ئەو ڕۆژەیان پڕکردبوو، بەشێوەیەك ڕەنگە نەتوانرێت بە ئاسانی وێنابکرێت، دایەو دۆستان‌و ئەزیزان بە خۆشحاڵییەکانی ئەوان زۆر خۆشحاڵبوون، ئیدی بەختەوەری هەموو لایەکی هۆڵەکەی تەنیبوو، خەم لە هیچ سوچ‌و قوژبنێکی ئەو شوێنەدا جێگەیەکی شك نەدەبرد، تیایدا دابنیشێت!

دایکی زاوا.. کە زۆر لە مێژ بوو ئاواتی ئەوەبوو لە زەماوەندی کوڕە تاقانەکەیدا بەشداری بکات، هەربۆیە ئەو ڕۆژە لە هەمووان زیاتر دڵخۆشبوو، چاوەکانی بڕیبووە ڕووخساری جوانی کوڕە شیرینەکەی‌و نقومی خەیاڵاتی خۆشی ببوو، نەیدەزانی لە خۆشیدا بگری، یاخود پێبکەنێت؟!!

کاتێکیش دەیبینی کوڕەکەی زۆر دڵخۆشە، ئەوەندەی تر شادمان دەبوو..

بەڵام بەداخەوە ئەوەی نەدەبوو ڕوویدات ڕووی دا، لە ناکاو خەم جێگەی خۆشی‌و شادی گرتەوە، گریان شوێنی خەندەی گرتەوە، خۆشحاڵی ئامادەبووان گۆڕا بۆ خەم‌و پەژارەیەك کە ئاستەم بوو چارەسەرکردنی..

دەزانی کێ هۆکاربوو؟

بووکەخان، بە زەردەخەنەو خۆشحاڵییەکانی دایکی زاوا، خۆشحاڵ نەبوو، ئەو بە تێڕوانینێکی دوژمنکارانەوە لە خەسووی دەڕوانی، هەربۆیە ئەو خۆشحاڵییەی زاوای بە دەرفەت زانی‌و بە گوێی زاوادا چپاندی‌و وتی: دەبێت دایکت لەسەر منەصەکە دابەزێنیت‌و بچێتە خوارەوە!!!

زاوا بە بیستنی ئەم وتەیە زۆر نیگەران بوو، لە دڵی خۆیدا ئەم وتەیەی چەند جارێك دووبارە کردەوە، بیری دەکردەوە چی بکات لە دایکی، بۆئەوەی دڵی بووکەخان ڕازی بکات؟!

لە ناکاوو لە هەڵوێستێکی چاوەڕوان نەکراودا، هەستایە سەرپێ‌و مایکرۆفۆنەکەی بە دەستەوە گرت‌و بە دەنگێکی بەرز وتی: (کێ دایکم لێدەکڕێت؟!)

ئەم وتەیەی سێ جار دووبارە کردەوە، تەواوی ئامادەبووان بە بیستنی ئەم قسەیە سەرسام ببوون، بەڵام نەیاندەزانی چی ڕوودەدات، ئەم قسانەو لەم کاتەدا بۆ؟ هەمووان لەبەرخۆیانەوە دەیانگوت: چۆن لە یەکەم شەوی هاوسەرگیریدا زاوا دایکی دەفرۆشێت؟

ئەوان لە بێ وەفایی کاکی زاوا زۆر پەست‌و نیگەران بوون، ساڵانێك بوو ئەم دایکە داماوە چاوەڕێی ئەمڕۆژەی دەکرد، ئێستاش لەبری پاداشت لە زەماوەندەکەیدا دایکی هەڕاج دەکات!!

بەڵام هیچ کەس نەبوو، وەڵامی کاکی زاوا بداتەوە؟

کاتێك هیچ کەس وەڵامی نەدایەوە: زاوا وتی: کەواتە خۆم دایکم دەکڕم!

سەیرێکی بووکەخانی کردو لە بەردەمی ئامادەبوواندا بە توڕەییەوە وتی: تۆم تەڵاقداو بۆ هەمیشە لە یەکدی جیابووینەوە!

ئیدی دەستی دایکی گرت‌و لە هۆڵەکە چوونە دەرەوە، ئەم هەواڵە بەناو هەموو ئامادەبوواندا بڵاوبووەوە، یەکێك لە ئامادەبووان کە زانی کوڕەکە لەبەرخاتری دایکی ئەو کارەی کردووە، ڕۆیشت بە دوایانداو بانگی کوڕەکەی کردو پێی وت: تۆ پیاوی کوڕی پیاوی، خاوەنی هەڵوێستێکی جوامێرانەی، ئەوا بڕیارمدا کچەکەی خۆمت پێببەخشم، بەو مەرجەی هەردووکتان بە یەکدی ڕازی بن!

زۆر ڕاستە کە هەر کەس لەبەر خاتری خودا واز لە شتێك بهێنێت، خوای گەورە زۆر لەوە باشتری پێدەبەخشێت!

پەندێکی کوردیم وەبیرهاتەوە، کە دەڵێت: زۆرجار بووك لەسەر ئەسپ دەگەڕێتەوە!

ئەم ڕووداوە خەیاڵ‌و دروستکراو نییە، بەڵکو چیرۆکێکی ڕاستەقینەیە!

سەرچاوە:
http://mssa.7olm.org



ئا: بێگەرد فارس

# پەروەردە بە سزادان، سزادانیش بە لێدان!

وازم لێبێنن با لە منداڵەکەم بدەم تا پەروەردە بێت، ئەگەر لێدان نەخوات ئەوا باش پەروەردە نابێت، هەروەك چۆن خۆشم بە منداڵی بە لێدان پەروەردەکراوم، دەبێت ئەویش بەو شێوە پەروەردە بکەم!

ئەوە دەربڕینی ناخی دایکانو باوکانە کاتێك بەهۆی ڕەفتاری نەشیاوی منداڵەکانیانەوە هەڵدەچنو توڕە دەبن، پێشیان ناخۆشە هەرکەسێك ڕێگریان بکات لە لێدان، یان سزادانی منداڵەکانیان.

زللە، قژڕاکێشان، داخکردن، بەندکردنی لە نێو تەوالێت، دەرگا داخستن لەسەری، ...هتد، ئەمانەو چەندین شێوازی تری سزادان، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە ئەم دایكو باوکە لە منداڵیدا بە لێدان سزادراون.

سەرجەم پسپۆرانی پەروەردە باس لەوە دەکەن کە سزادانی منداڵ بە لێدان باش نییە، بەڵکو سزادانی بەدیل هەیە، ئەویش ڕێگریکردن، یان قەدەغەکردنی منداڵ لەو شتانەی کە ئارەزووی دەکاتو حەزی لێدەکات، بۆ نموونە سەیرکردنی تەلەفزیۆن، یان یاریکردنو پارە خەرجکردن، چونکە ئازاردانی جەستەی منداڵ سوکایەتی پێکردنییەتیو ئازاری دەروونیشی دەداتو دەبێتە هۆی دروستبوونی گرێی دەروونی لای منداڵ، زۆر گرانە لە داهاتوودا ڕووبەڕووی ببێتەوە، ئەوەش هەڕەشە لە جێگری باری خێزانیو کۆمەڵگە دەکات، بەتایبەتی ئەگەر ئەو لێدانە لەبەرچاوی کەسانی تربێت، هەڵەیەکی زۆر گەورەیە، هەر باوان خۆیان گیرۆدە دەبن لە داهاتوودا.

زانای دەروونناسی بەناوبانگ (د. جینو) لە کتێبەکەیدا باس لە پەروەردەکردنی نموونەیی دەکاتو دەڵێت: پەروەردەکردن، هونەرە، شارەزاییە، پێویستە فێربکرێن، ئەمەش بە سزادانو لێدان نایەتەدی، بەڵکو لە ڕێگای تەکنیکی پەیوەندی نوێ، بۆ نموونە گۆڕینی ڕێگەی کۆن، یان ئەو ڕێگە تەقلیدیەی دایکانو باوکان لەگەڵ منداڵەکانیان مامەڵەی پێدەکەن، یان لە ڕێی شێوازی گونجاوی سەردەم، بۆ نموونە تێگەیاندنو فێرکردنیان بێ هەڕەشەکردنو سزادان، ڕەخنەگرتنت لێیان بێئەوەی سوکایەتی، یان بچووككردنەوەی کەسێتی تێدابێت، ستایشکردنی بێئەوەی یەکسەر دەست بە فەرمانکردن بکرێت، یاخود توڕەبوون لێیان بێئەوەی ئازاردانی لەگەڵدا بێت، دانان بە هەستەکانی منداڵو ڕاوبیرۆکەکانیان، بێ گفتووگۆی زیادە لەگەڵیدا، وەڵامدانەوەی ئەوەی منداڵ دەیەوێت بە شێوەیەك کە فێربکرێن متمانەیان بە کەسانی تر هەبێتو متمانەی خۆشیان گەشە پێبدەن.

(دیانا بومریند) پسپۆری دەروونزانی لە ڕێگەی ئەو لێکۆڵینەوە مەیدانییەی ١٠٠ خێزانی گرتووەتەوەو پێی گەیشتووە، دەڵێت: هەندێجار سزای جەستەیی قبووڵە، هیچ بەڵگەیەك ڕێگری لێدانی بە تەواوی نەکردووە، بەرگری ئەوە ناکەم کە دایکانو باوکان سزادانی جەستەیی بەکاربهێنن، بەڵام نەگەیشتووینەتە ئەوەی کە لێدانێکی کەمو سادە کاریگەرییەکی خراپی دەگمەنی هەبێت، ناشبێتە هۆی زیانێکی درێژخایەن بۆ گەشەی دەروونیو کۆمەڵایەتی، بەڵگە، یان نموونەش بۆ ئەمە، چەندین منداڵی سزادراو پاش گەورەبوونو پێگەیشتنیان کەسانی باشو داهێنەرو سەرکەوتوویان لێدەرچووە!

لێرەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە پێویستە باوان شارەزایانە مامەڵە لەگەڵ نەوەکانیاندا بکەنو هاوسەنگی بکەن، نە پێدانی ئازادییەکی ڕەهاو وازهێنان لێیانو کەمتەرخەمیکردن، نە زۆر چاودێریو توندوتیژبوون لەگەڵیان تا ئەو ڕادەیەی متمانەی خۆیان لە دەست بدەنو متمانەی منداڵەکەش بەخودی خۆیان نەمێنێت.

بەرزان ئەبوبەکر



# ئەو سیفەتانەی پیاوان حەزناکەن لە هاوسەرەکانیاندا هەبێت

هەروەکو چۆن ژیان بەردەوام گەشەسەندنو پێشکەوتنو بەرەوپێشچوونی بەخۆیەوە بینیوە، بە هەمان شێوەش ژیانی هاوسەریو پێکەوە ژیانو بەردەوامبوون پێشکەوتنو بەرەوپێشچوونی دیاری بەخۆیەوە بینیووە، نەریت گەلێك کە لە ڕابردوودا باوودیار بوو، ئێستا نەریتی باشترو چاکتر شوێنی گرتووەتەوە، هاوسەرانی ژیرو بە ئەزموون هەوڵدەدەن بە چاوی هەنگ بۆ یەکدی بڕوانن و پێکەوەژیانو بەردەوامی دەکەنە ستراتیژو ئامانجی ژیانیان، بەردەوام لە هەوڵی سارێژکردنی برینەکاندانو هەموو تواناییان دەخەنە کار بۆئەوەی لە یەکدی تێبگەنو خاڵە ناکۆکییەکانی نێوانیان ڕابماڵنو خاڵی هاوبەشو ئەرێنی پەرەپێبدەن.

لەم بابەتەدا ئەو سیفەتانە بەبیر خوشکانی ئەزیز دەهێنینەوە کە پیاوان حەزناکەن لە هاوسەرەکانیاندا هەبێت.. بێگومان مرۆڤ تا لە سیفاتە خراپەکان خۆی دانەڕنێت، ناتوانێت خۆی بە سیفاتی جوانو ئەرێنی بڕازێنێتەوە..

**دیارترین ئەو سیفەتانە:**

**١- ئافرەتی زاڵ، یا باڵادەست:**

بوونی ئەم سیفەتە لە ئافرەتدا واتە حساب نەکردن بۆ کەسایەتیو هەستی هاوسەرەکەی، ئەم جۆرە ئافرەتە پرسو ڕاوێژ بە هاوسەرەکەی ناکاتو لە بەڕێوەبردنو کاروباری نێوماڵدا نایخوێنێتەوەو بەشداری پێناکات، هەموو کاروبارەکان خۆی ئەنجامی دەدات بەبێئەوەی حساب بۆ بیروڕای هاوسەرەکەی بکات، لەم بارەدا پیاو هەست دەکات کە ڕۆڵی لە دەستداوە، ئەگەر ناخی خۆییت بۆ هەڵڕێژێت ئەو کات دەزانیت تەنها پەیوەندییان بە هۆی منداڵو جگەرگۆشەکانیانەوەیە..

**٢- شەیدای درۆ:** گرنگترین بنەماو ئاکاری نێوان هاوسەران ڕاستگۆییە، سەرەکیترین خاڵە بۆ بەردەوامیو بەختەوەریو پێکەوەژیان، بەداخەوە هەندێك لە ئافرەتان شەیدای درۆکردنن، ئەمەش وەکو ئارەزوویەك، یان ترسان لە دەرکەوتنی ڕاستییەکان، ئافرەتان پیادەی دەکەن، لە هەموو بارودۆخێکدا مرۆڤی ژێر زۆر ڕقی لە درۆو فێڵکردنە، بێگومان ژیان لەسەر درۆکردن بنیاتنانرێت، خۆئەگەر تەنها یەکجار ڕاستی درۆکردن دەرکەوت، ئیدی بۆ هەمیشە خاوەنەکەی متمانە لە دەستدەدات. درۆ هۆکارێکی سەرەکییە بۆ لە یەکترازانو جیابوونەوەی هاوسەران، درۆکردن سەردەکێشێت بۆ ناپاکی نێوان هاوسەران، قێزەونترین سیفەتی مرۆڤە، دەڵێن لە فەرهەنگی هندییە سوورەکاندا وشەیەك بە ناوی درۆکردن بوونی نییە، خۆزگە هەر یەك لە ئێمەش دەمانتوانی لە فەرهەنگی خۆماندا وشەی درۆ بسڕینەوە.

**٣- هاروهاج:**

پریشكو ئاگری ئەم کەسە تەنها هاوسەرەکەی لە نێوماڵدا ناگرێتەوە، بەڵکو هەمیشە دەبێتە مایەی شەرمەزارکردنی لەبەرچاوی دراوسێو هاوڕێو کەسوکاری، چونکە هەمیشە بە زمانی زبرو توندو قسەی ناخۆش لەگەڵ بەرامبەرەکەیدا دەدوێت، هەربۆیە بەردەوام کێشەو ناکۆکی بۆ هاوسەرو منداڵەکانی دەنێتەوە. هەر ڕۆژە دڵی دراوسێیەك لە خۆی دەڕەنجێنێت، بوونی ئەمجۆرە سیفەتە واتە نەبوونی میوانو دۆستایەتیو خزمایەتی، چونکە خزمو دۆستانی لە ترسی قسەی زبرو توندو ناخۆش، حەزناکەن سەردانیشیان بکەن.

**٤- ئافرەتی توندوتیژ:**

ئەم کەسە ناتوانێت بژی، تەنها لە کەشێکدا نەبێت کە پڕە لە ئاژاوەو گێژەڵۆکەو ڕەشەبای توند، هەموو قسەیەکی هاوسەرەکەی بە پێچەوانەوە لێکدەداتەوە، بۆیە لەسەر هەر قسەیەك هەرایەك دەنێتەوە، هەمیشە لە خاڵی ناکۆکی نێوان خۆیو هاوسەرەکەی دەگەڕێت، هەر بۆیە هاوسەرەکەی زۆربەی کاتەکانی ژیانی لە دەرەوەی ماڵ بەسەردەبات، کورد وتەنی شوێنی ناخۆشی ماڵی خۆیانە..

**٥- ئافرەتی گۆشەگیر:**
لــە هەمــوو ئەو کارانە خــۆی بە دوور دەگرێت کــە تایبەتە بە هاوســەرەکەیەوە، جگە لە حــەزو ئارەزووەکانی خۆی، گرنگی بە هیچ شــتێکی دی نادات، هەمیشــە چێژ لە تەنیایــی دەبینێت، پارێزگاری لە هەموو ئەو شــتانە دەکات کە خۆی دەیبیستێ، یان دەیبینێت، یاخود هەستی پێدەکات.

**٦- ئافرەتی نالەبار:** هەرگیز گوێڕایەڵی فەرمانو داواکارییەکانی هاوسەرەکەی نابێت، هیچ حســابێك بۆ کەســایەتی هاوسەرەکەی ناکات، تەنانەت وەکو هاوبەشی ژیانیشی دان بە هاوسەرەکەیدا نانێت.

**٧- ئافرەتی سەرکەشو ئینکار:** لە هەموو شتێکدا نکولی دەکات، هەمیشە چێژ لە ئینکاریو کەللەڕەقــیو ســەپاندنی بۆچوونەکانی خۆی دەبینێت، هەرچەنــدە هەڵەش بێت، تەنانەت ئەگەر هاوسەرەکەی حەز لە خواردنێك بکاتو داوای لێبــکات بۆی ئامادە بکات، ئەو پێداگری دەکاتو جۆرێکی دیکەی خواردن ئامادە دەکات کە خۆی ئــارەزووی دەکات، پیاوان زۆر ڕقیان لەمجۆرە ئافرەتانەیە..

**٨- ئافرەتی تەممــەڵ:** ئەمجۆرە ئافرەتە حــەز بــە کارکــردن نــاکات، هیــواو ئاواتی دانیشــتنو خەوتنــە، هەمــوو کات ماڵەکەی پرشوبــڵاوە، پەنجــەرەو دیــوارو گڵۆپی نێو ماڵەکەی یەکپارچە تۆزو خۆڵە، تەنانەت حەز بە خوێنــدنو خوێندنەوەش نــاکات، چونکە هــەوڵو ماندووبوونــی دەوێــت، دەگێڕنەوە جارێکیان لە ئاهەنگێکدا ئافرەتێکی زۆر شۆخو شەنگ، بەڵام تەممەڵو بێ هیواو ئاوات، دەڕوات بۆ لای زانایەك کە ئامادەی ئەو ئاهەنگە بوو، بەڵام لە شــێوەو ڕووخســاردا زۆر ناشــیرین بووە، پێی دەڵێت دەمەوێت ببمە هاوســەرت، بۆئەوەی منداڵەکانمان وەکو من شۆخو شەنگ بــنو وەکو تۆش زیــرەكو لێهاتوو بن؟ زاناکە لە وەڵامدا پێی دەڵێت: ببورە ناتوانم، چونکە دەترسم لە تەممەڵیدا وەکو تۆ بنو لە شێوەو ڕووخساریشدا وەکو من!!

**٩- ئافرەتــی ڕۆتینی:** ئەمجۆرە ئافرەتە وادەزانێت ئەنجامدانی پرۆسەی هاوسەرگیری کۆتــا ئاواتی ژیانــە، دوای چوونە ناو ژیانی هاوســەری ئیــدی هیــواو ئاواتێکــی دیکە شــك نابات، هەمــوو ڕۆژێك کە بەســەریدا تێدەپەڕێت وادەزانێت ڕۆژی پێشوو ترە.

ئەمانــە چەنــد ســیفەتێکی نەرێنــی بــوون کــە لــە هەنــدێ لــە هاوســەراندا بوونیــان هەیە، بــەو هیوایەی هاوســەران پێکــەوە بەخۆداچوونەوەیــەك بکــەنو هەمووان خۆمان بە ســیفەتە ئەرێنییەکان بڕازێنینــەوەو ســیفاتە نەرێنییەکانیش لە خۆمان دارنین.



# کاتێك هێڵی سورت بەزاند

- کاتێــك دەنگــت بــە ڕووی دایــكو باوکتدا بەرز دەکەیتەوە، یان هاوار دەکەیت بەســەریاندا، یــان دڵیــان دەڕەنجێنیتو فەرمانەکانیــان جێبەجێناکەیــت.. ئــەوا دەڵێین ببورە، هێڵی سورت بەزاندووە!

- کاتێــك فێــڵو تەڵەکەبــازیو هەڵخەڵەتاندنو چاڵ بۆ خەڵك هەڵکەندن، دەکەیتە نەریت.. ئەوا دەڵێین ببورە، هێڵی سورت بەزاندووە!

- کاتێــك ژێریــت حەقو ڕاســتی لە ناڕەواو چەوتو خواری جیاناکاتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە شوێن ئەوە دەکەویت کە نەفســی خراپەکارت فەرمانــت پێدەکات، دەبیتە بەندەی هەواو ئارەزووەکانت، ئەوا دەڵێین ببورە، هێڵی سورت بەزاندووە!

- کاتێك ئامــۆژگاری خەڵکی دەکەیتو ڕێنماییان دەکەیت بۆ چاکەکردن، لە هەمان کاتدا خــۆت پێچەوانەکەی ئەنجام دەدەیت، ئەوا دەڵێین ببورە، هێڵی سورت بەزاندووە!

- کاتێــك بــە نــاڕەوا ماڵــی خەڵکی دەخۆیــت بەبێنەوەی مافــی تۆبێت، یان لــە ڕێگەی وەرگرتنی ڕیشــوەوە، یان ماڵی منداڵانی بێباوك دەخۆیت، دەڵێین ببورە، هێڵی سورت بەزاندووە!

- کاتێــك چروکیــت دەگاتە ئاســتێك کە دەســتت لــە خۆشــت دەگریتــەوەو خێــزانو منداڵەکانیشت لە خۆشــیو شادی ژیان بێبەش دەکەیت، لە کاتێکدا خوای گەورە ڕۆزییان دەدات، ئەوا دەڵێین ببورە، هێڵی سورت بەزاندووە!

- کاتێــك پەیمــانو بەڵێنەکانــت بەجێناهێنیــت، ناپاکی لــە ئەمانەتەکان دەکەیــت، ڕاســپاردەکان ناگێڕیتــەوە بۆ خاوەنەکانیان، ئــەوا دەڵێین ببورە، هێڵی سورت بەزاندووە!

- کاتێــك شــایەتی نــاڕەوا دەدەیــت، ڕۆژانە ئەم کارە دووبارە دەکەیتەوە.. ئەوا دەڵێین ببورە، هێڵی سورت بەزاندووە!

- کاتێــك لاوێتیــت لە بەســەربردنی هــەواو ئارەزووەکانتــدا بەســەر دەبەیت، کارکــردنو خۆئامادەکردنــت بــۆ ڕۆژیی دوایــی لە یاد دەچێت، ئەوا دەڵێین ببورە، هێڵی سورت بەزاندووە!

- کاتێــك کاتە بــە نرخەکانی ژیانت لــە کاری بێ ســوودو بێهودەو بــێ مانادا بەسەر دەبەیت، کارێك ناکەیت کە سوودی بۆ دنیــاو دواڕۆژت هەبێت، ئــەوا دەڵێین ببورە، هێڵی سورت بەزاندووە!

- کاتێك دەســەڵاتت هەیــە، هەژارانو بــێ نەوایان دەچەوســێنیتەوە، ســتەم لە بێدەســەڵاتانو لاوازەکان دەکەیــت، ئــەوا دەڵێین ببورە، هێڵی سورت بەزاندووە!

کەواتــە ئێمەی مــرۆڤ ســنورێکمان هەیە، کە ناتوانیــن بیبەزێنین، بەزاندنی ئەو سنورانە هێڵی سورە!

درەخشان بەهادین

# خزمەتکردن، بە کام هۆ؟!



بنەمای خزمەتکردن ئەوەیە کە لەبری ئەوەی تەنها لە بیری بەرژەوەندی تایبەتی خۆماندا بین، با بە خزمەتکردن سوود بە کەسانی دی بگەیەنین. زۆرێك لە ئێمە پێمان خۆشە خزمەتمان بکەن، بە ئەندازەیەك هەندێ کات وا دێتە بەرچاو کە دڵمان دەیەوێت کە تەواوی دنیا خزمەتی ئێمە بکات، هەڵبەت ئەمە گرفتێك نییە، تەنها دەبێت ئەو بنەما کۆنو مێژووییە لە بیر نەکەین کە: "هەر شتێکت دەوێت، سەرەتا دەبێت ئەو شتە ببەخشیت." هەر بەو جۆرەی کە ئەگەر پارەت بووێت، دەبێت پارە ببەخشیت، ئەگەر سۆزو خۆشەویستیت دەوێت، دەبێت بەسۆزو موحیبەت بیت لەگەڵ دەوروبەردا، ئەگەر دەتەوێت خزمەتت بکەن، دەبێت تۆش خزمەت بکەیت.

خزمەتکردن ڕێگایەکی دوو ئاڕاستەیە، ئێمە دەبێت بۆ خزمەتکردنی کەسانی تر هەستێکی باشمان هەبێت، کاتێك خزمەت دەکەین ئەو هەستە باشە زیاتر دەبێتو زۆرتر هەستی پێدەکەین، ئەمە جگە لەوەی کە لە ژیاندا سەرکەوتوو تر دەبین. پەندێکی چینی دەڵێت: (ئەگەر کاتژمێرێك خۆشبەختیت دەوێت، وەنەوزێك بدەو سەرخەوێك بشکێنە. ئەگەر ڕۆژێك خۆشبەختیت دەوێت، بڕۆ بۆ ڕاوەماسی، ئەگەر مانگێك بەختەوەریت دەوێت، زەماوەند بکە، ئەگەر ساڵێك خۆشبەختیت دەوێت، میراتییەکی گەورە ببە، ئەگەر تەمەنێك خۆشبەختیت دەوێت، خزمەتی کەسانی تر بکە).

لە ڕاستیدا هەر کاتێك سەیری ڕابردوومان دەکەین لەو ساتانەی ژیانمان زۆرترین هەستی ڕازیبوونمان هەیە، کە بە عەشقو موحیبەتەوە خزمەتێکمان کردووە، هەر لەم سەردەمی هەلپەرستیو بەرژەوەندی خوازییەدا کاریگەرترین کەسانی سەر گۆی زەوی لە هەموو کۆمەڵگاکان بێ جیاوازی ئەوانەبوون کە زۆرترین خزمەتیان بە تەواوی مرۆڤایەتی کردووە. (ئەلبرت شواریتزر، مهاتما غاندی، مادر ترزا، نلسۆن ماندێلا)، تەنها چەند ناوو کەسایەتییەکی هەڵکەوتوو ناسراون، لە ڕیزی ڕیزبەندی گەورەی مرۆڤە خزمەتگوزارەکانی سەدەو سەردەمی ئێمە. ئەوەی ئەوان لە کەسانی تر جیا دەکاتەوە گەورەیی شایستەییانە لە خزمەتی بێ منەت، بێ وێنەو بەردەوامییانە بۆ تەواوی مرۆڤایەتی لە سەرتاسەری دنیادا.

ئەگەر هەر کەس ناچار بێت، خزمەت دەکات، بەڵام خاڵی مەبەست ئەوەیە کە بە ویستی خۆمان خزمەت بکەین، لە خزمەتکردندا دەستپێشخەربین. بەشێکی گەورەی دنیاو ژیانی ئەمڕۆ کێبەرکێ کردنە بۆ دەستخستنی زۆرترین بەرژەوەندی تایبەتی، بێڕەچاو کردنی کەڵكو قازانجی گشتی. لە خزمەتکردنیشدا خاڵی جێی سەرنج ئەوەیە کە بە مەبەستی سوودمەندبوونی کەسی بەرامبەرو کەسانی تر خزمەت بکەین. وەها خزمەتێکیش تەنها لە هەستی کەسانێك کە بە خواستی ئارامیو دیدی ڕێزو خۆشەویستی لە هاوشێوەکانیان دەڕوانن سەرچاوە دەگرێت، کە دەزانن ئەوانیش دروستکراوی خودان، خوداش خزمەتگوزارانی خۆشدەوێت.

ئێمەی مرۆڤ، هەموومان بە کۆمەڵە تاڵێکی نادیارو تۆڕێکی پەیوەندیداری گەورە بە یەکەوە پەیوەستین. هەر کارێك کە بۆ خۆمان دەیکەین لە سەر یەك بە یەکی تاڵەکانی ئەو تۆڕە کاریگەری دەبێت. هەر کارێك کە بۆ کەسانی تر ئەنجامی دەدەین ئەویش بە هەمان کاریگەرییەوە لە سەر تەواوی تۆڕەکە کاریگەری دەبێت، سەرەنجام ڕۆژێك بەرەو خۆمان دەگەڕێتەوە. گرنگ نییە ئەمڕۆ بێت، یا دە، بیست، یا چل ساڵی تر، گرنگ ئەوەیە کە خزمەتکردنی ئێمە بۆ بەرامبەرەکەمان نە تەنها ژیانی ئەو دەوڵەمەند دەکات، بەڵکو لە دوایشدا ڕۆژێك بە ئاڕاستەی خۆمان دەگەڕێتەوەو ژیانی ئێمەش دەوڵەمەندتر دەکات.

خزمەتکردن هەر تەنها تایبەت نییە بە کاری گەورە. هەر ڕۆژ دەتوانی بە کارو خزمەتی بچووك، دڵی کەسێك شاد بکەیت، بەو جۆرەش ژیانی خۆت سەرکەوتووتر بە سەر دەبەیت، لە کاری بچوکەوە دەست پێ بکە، بزانە دواین جار بۆ ئەوانەی لێتەوە نزیکنو ئەو کەسانەی کە لە گەڵیاندا دەژیت، خزمەتێك کە ئەنجامت داوە کەی بووە؟ بزانە لە شوێنی کار کردنتدا دەتوانیت چ خزمەتێك بە هاوکارانو کەسانی تر بکەیت، بزانە لە گەڕەكو شارەکەت دەزگایەکی زانستیو فەرهەنگی خۆبەخشانەو یارمەتیدان هەیە بۆئەوەی ناوی خۆتی لێ تۆمار بکەیت، تا هەفتانە چەند کاتژمێرێك، یاخود مانگانە




و: م.خەولە هەمزە شێخانی

کارێکی تایبەتی ئەنجام بدەیت؟

وردبەرەوەو بزانـــە، کاتێك کە دەتەوێت خزمەتی کەســـانی تر بکەیت چ مەبەستێکت هەیـــە؟ پاداشـــتو دەســـتکەوت، یاخـــود خۆشەویستیو دڵسۆزی! زۆرتری ئێمە کاتێك کە وشەی "خزمەت" دەبیستین بیر لە شتێك دەکەینەوە کە لە ئەنجامدانی شەرم دەکەین، لـــە کاتێکدا کە ئێمـــە بـــە ئەنجامدانی ئەو کارەی کە پێمان خۆشەو بۆی بە دی هاتووین زۆرترین خزمەتی خۆمانو دروستکراوەکانی دیکـــە دەکەین. ئەگەر هـــەر ڕۆژ بەو نیازە لـــە خەو هەســـتینو بـــۆ ئەو مەبەســـتە لە ماڵ دەربچین، تـــا خزمەتێك بکەینو کارێك ئەنجـــام بدەین، ئەوە ئـــەو کارە دەبێتە هۆی شادیو دڵخۆشیمان، ئێمە بە خزمەتکردنمان ئەو شـــادییە بۆ کەســـانی تـــر دەگوازینەوە، کەواتـــە بڕیار بدەو بزانـــە ئەمڕۆ دەتەوێت خزمەتی چ کەسێك بکەیت؟

ڕاهێنان:

١- ئـــەم هەفتەیە ســـەرنج بـــدەو بزانە چ کارێـــك بـــە باشـــی ئەنجـــام دەدەیت، کە دەتوانیت کەســـانی تریـــش فێر بکەیت. ئەو خزمەتـــە تایبەتییـــەی تـــۆ، خزمەتکردنی هەموو دنیایە.

٢- ئایا شێوەیەکی سادە لە خزمەتکردن هەیـــە کە بتوانیت بەشـــێوەیەکی ڕێکوپێك ئەنجامی بدەیت؟

٣- ئایا ســـەرنجت داوە کە خزمەتکردن وەك دەواو چارەســـەرێکی وزەبەخشـــە کـــە گیانـــی کارکـــردن دەگـــۆڕێو دەبێتـــە هۆی خۆشـــیمانو ســـەرەنجام تەندروستیمان زۆر بـــاش دەبێت، خزمەت بکەو دواتر هەســـتی خۆت یاداشت بکە.

٤- ئایـــا ڕێگایـــەك هەیە کە لـــە تواناو بەهـــرەی خـــۆت بـــە نـــاوی شـــێوەیەك لە خزمەتکـــردن ســـوود وەربگریـــت؟ (ئەگەر هونەرمەندێکی نیگارکێشـــی ئارەزوومەندانە دیوارێکـــی شـــار ڕەنگین بکە، تا شـــار جوان و ڕازاوەتـــر بێـــت، ئەگەر زمانـــی ئینگلیزی دەزانیـــت ئـــەوا دڵخوازانـــە هەفتانـــە دوو کاتژمێـــر لەگەڵ ئەو منداڵانـــەی کە توانای نـــاو تۆمارکردنیـــان نییـــە لە خـــولو پۆلە تایبەتییەکاندا کار بکە....؟).

٥- بـــە ئەنـــدازەی ژمـــارەی مرۆڤەکانی ســـەر زەوی، ڕێگا بـــۆ خزمەتکـــردن هەیە. داهێنەربـــەو ڕێگای نوێ بـــۆ خزمەتکردنی کەسانی دوورو نزیکت پەیدا بکە.

٦- بزانـــە کاری بە ڕواڵەت بچوکی وەك کڕینی شـــتومەك بۆ دایە گەورەی پیرت، یا دراوســـێ نەخۆشـــەکەت، هەر خزمەتکردنە، ئەم هەفتەیە ئەم کارە ئەنجام بدە.

ســـەرکەوتنمان لـــە خزمەتکردنـــی کۆمەڵگاو مرۆڤایەتیدایە.

پـــەروەردگارا: نەمکەیـــت بەســـەربڕی مەڕەکان، وەنەشمکەیت بەبەرخۆڵەوسەربڕەکان سەرم ببڕن.

پەروەردگارا: یارمەتیم بدە تا لە ڕووی بەهێزەکاندا وشـــەی (هەق) بڵێم، وشـــەی ناهـــەق نەڵێم، تا چەپڵـــەی بێهێزەکان بە دەست بهێنم!

پەروەردگارا: هەردەم وام لێبکەیت، کە دیوەکەی تری تابلۆکان ببینم!

پەروەردگارا: ڕێگام نەدەیت، دووژمنەکانم بـــە خیانەتکار، تاوانبار بکـــەم، لەبەرئەوەی لەگەڵ بیروڕاکانمدا جیاوازن.

پـــەروەردگارا: ئەگـــەر ســـامانت پێبەخشیم هیوام لێ مەسێنەرەوە، ئەگەر بەختەوەریت پێبەخشیم، هۆشم (عەقڵم) لێ مەسینەرەوە.

پـــەروەردگارا: ئەگـــەر ســـەرکەوتنت پێبەخشـــیم، ئەوا ســـادەییو ســـاکاریم لێ مەســـێنەرەوە، ئەگەر ســـادەییو ساکاریت پێبەخشیم، شـــانازی کردنم بەڕێزداریم لێمەسێنەرەوە.

پـــەروەردگارا: فێـــرم بکـــە خەڵکـــم خۆشبووێت، هەروەکو چۆن خودی خۆمم خۆشدەویت، فێرم بکە سەرزەنشتی خودی خۆم بکـــەم، هەروەکو چۆن سەرزەنشـــتی خەڵکی دەکەم!

پەروەردگارا: فێرم بکە کە لێخۆشبوون بەرزترین پلەکانی بەهێزییە، تۆڵەکردنەوەش بێهێزییە!

پەروەردگارا: ڕێگام پێ نەدەیت، لە خۆم بایی بم، ئەگەر سەرکەوتنم بەدەست هێنا، نائومێدی نەمگرێت، ئەگەر شکستم خوارد، بەڵکو بە بیرم بهێنەوە کە هەردەم شکست تاقیکردنەوەیەکە پێش سەرکەوتن، ئەگەر لەسەرکەوتنیشـــت داماڵیم، ئەوە هێزێکم بـــۆ بەجێ بهێڵە کە بتوانم زاڵبم بەســـەر شکستخواردندا.

پـــەروەردگارا: ئەگەر لە تەندروســـتیت داماڵیـــم ئەوە خۆشـــی (نیعمەتـــی) بڕوام لێ مەســـێنە، ئەگـــەر خراپـــەم بەرامبەر خەڵکی کرد، ئازایەتی داواکردنی لێبوردنم پێببەخشـــە، ئەگـــەر خەڵکـــی خراپەیان بەرامبـــەر کردم، هێزی لێخۆشـــبوونم پێ ببەخشە!

پـــەروەردگارا: ئەگـــەر من تـــۆم لە یاد کرد، ئەوە تۆ من لە یاد مەکە.

# ئەوینێکی نوێ!!



هەرگیز ئـەو ڕۆژەم لە یاد ناچێت، کە ماڵاواییم لێکردیت، هێدی هێدی، پروشەی بارانێکی نەرم، هاوڕێ بە کزەبایەکی سارد ئەو دەروازە شوشەیەی لێڵ دەکرد، کە لەوێوە بۆ یەکترمان دەڕوانی، فرمێسکەکانی چاوی تۆ کە زەنگۆڵ زەنگۆڵ، بەسـەر ڕوومەتتدا دەهاتنـە خوارێ، زێتر دەیخستمە دەریای گریانێکی قوڵـەوە، جار جار دەمبینی چاویلکەکانت دادەگرتو بە دەسماڵێکی سپی، فرمێسکەکانت دەسڕی!

هەرچەنـدە هەمـوو وشـەیەکی تۆ بۆ من وانەیەکی پڕ تەلیسمو جوانیو مانای بەرزە، بەڵام نیگای بێدەنگو ڕوانینی وردت دەمخاتە جیهانی خەیاڵی جوانو بەهەشتی تێڕامانو بیرکردنەوەیەکی بێ سنوور!

ئـەوڕۆژە لە بەرەبەیانێکی زوودا بەم چەند دێڕەشیعرە ماڵاواییت لێکردم:

ئەو هەمدەمی غەمخوارو نەدیمی منە

یا ڕەب

ئەو مەحرەمی ئەسرارو قەدیمی منە

یا ڕەب

ئـەو گەوهەری شـەهوارو یەتیمی منە

یا ڕەب

کەوتۆتە چ بەحرێکـەوە، خنکاوە دڵی من؟!

دەسـتەکانت هەڵبـڕیو دەسـتی دوعاخوازیـت بڵند کردو هێـواش هێواش بەجێتهێشـتمو لـە چـاو ونبـووی، بەڵام نەمتوانـی بـۆ تەنهـا سـاتێك لەبەردیدی خەیاڵم ونتکەم، هەرچەندە بە لاشە هەزاران میل لێت دووركەوتبوومەوە، بەڵام هەردەم وەکو ئەوەی هاوڕێو هاودەمی سـەفەرەکەم بیت لەگەڵتدا دەدوام، قسـەم بۆ دەکردیت، بەرامبەر بە سیمای نوورینت پێدەکەنیم!

گریـی دڵم بۆ دەکردیتـەوەو ئاوێزانی قسە جوانو وتە شیرینەکانت بووم!

تـا ئـەو ڕۆژە نەمدەزانـی کـە مـن سەوداسـەری ئەوینێکـی نوێـم! تـا ئـەو ساتە بەهای فرمێسـکو هەستی پڕ میهرو خۆشەویستیو ئەوینی خوداییم نەدەزانی!

ئـەو کاتە من لـە ژووانـی ئەوینێکدا فرمێسـکم هەڵدەوەرانـد، کـە تـا ئێسـتا هیـچ ئەویندارێکی بازاڕی عیشـق بە ڕازو نهێنییەکانی ئاشنا نەبووە!

لەو سەفەرەمدا نامەکانی تۆ چرایەکی نوورین بوون، لە شـەوی ئەنگوسـتە چاوو دەیجورا، ڕێگایان بۆ ڕووناك دەکردمەوە، لە یەکەم نامەتدا کە بە تاسـەوە ماچم کردو بـە هەردوو دەسـتم باوەشـم پێداکردبوو نووسیبووت:

خودایـە جیهان بێ خۆشەویسـتی تۆ، دەبێت چۆن بێت؟

ئەو ئاسـمانە چاوشـینە، ئـەو هەورە سـپیانە، دەبێت چ بەرگێکی ڕەشی سەرتاپا سیا بپۆشن؟

خودایـە: بـێ ئەوینـی ڕاسـتەقینەی تـۆ، هیـچ لێوێـك دەتوانـێ خەندەیـەك ببەخشێت؟

هیچ دڵێـك دەتوانێ، ببێتـە ئاوێنەی ئەوینێك؟

هیچ چاوێك دەتوانێ دڵۆپێك فرمێسکی پڕ میهرو پڕ لە سۆز ببەخشێت، خودایە بێ نوری بێ وێنەو بێ باخی ئەوینی نەبڕاوەت، بێ سۆزو بێ میهرو ڕەحمەتت، بێ لوتفو بێ عەتفی تۆ خودا، چیم دەکرد، ژیانم چۆن دەبا؟!

خودایە، تۆ جوانیت، جوانمکە، خودایە بەهێزو توانـای خۆت، بەرامبەر بەم ژیانە دژوارە، بەهێزو توانام بکە!

خودایـە هـەژارم، بێنەوام، بێکەسـم، خودایـە مـن بەنـدەی بچکۆلـەی تـۆی گەورەم!

خودایە تـۆ تواناو تۆ زاناو تۆ دانای.... ڕێم بدە واهاتووم

سووتاوی گڕی ئەو ئەوینەم کە ڕێگەی بەهەشتە، خودایە بمبەخشە!

خۆ ئەگەر نەمبەخشی، کێ هەیە بێ لە تۆ بمبورێ؟ کێ هەیە بمبەخشێ؟!

ئەگەر تـۆ دەرگای خـۆت دابخەی، لە دەرگای کێ بدەم؟

خودایە تۆ خودای بە میهرو بەخشندەو بەزەییو بەسۆزی

واهاتـووم بۆ لای تۆ، بە ئاوی غوفرانت بشۆرە سەراپای عیسیانم..

مـن ئیتر پەیمانی خۆم داوە بە تەنهاو هەمیشە بەندەی تۆم

من ئیتر ئەوینی خۆم زانی تا مابم لەو ڕێیە لانادەم!

بـە دەم خوێندنـەوەی نامەکەتەوە لە دوای گریانێکـی بـە کوڵ، بە دانیشـتنەوە خـەوم لێکەوتبوو، بە دەنگی بانگی بەیانی بەخەبەرهاتم، دەستنوێژم هەڵگرت، بەرماڵی بەندایەتیـم ڕاخسـت، لەگـەڵ موناجاتی خودایيـدا، بەدەم هەنسـكو خوێندنەوەی سـورەتی (ئەلحەمد)ەوە، ئاوێتەی جیهانێك بـووم، کـە جگە لە خـودای گـەورە هیچ شتێکم بیر نەما!

ئەوسـا زانیم خودای گـەورە، دەرگای ئەوینێکـی نوێی لەبەردەمدا واڵاکردوم، کە ئەوینێکـی زۆر بێ وێنەیە، بۆیە بڕیارم دا، بـە زووترین کات بگەڕێمـەوە ژووانی ئەو ئەوینە!

هیلال

و: شاهین وەحید

# دڵم تەنگە، بەڵام ناگریم...



دایکـی (دانیـال چاروسـایی) دەڵێت: (دانیال) گەنجێکی (١٧) ساڵان بوو، بە هۆی ڕووداوێکـی هاتوچۆوە تووشـی جەڵتەی مێشك بوو. دەڵێت: هەرچەندە دڵم ئارامە، بەڵام دڵم بۆ (دانیال) تەنگبووە.

ڕۆژی (٢٦)ی مانگی ڕەمەزان لە ڕێگای پەیامنێری هەواڵی ایسـنا لە خۆراسان ئەو هەواڵە بڵاوکرایەوە کە (دانیال چاروسایی) لەگەڵ ئۆتۆمبێلێك دووچاری پێکدادان بوون، بەو هۆیەشەوە سەری بە شۆستەی شەقامەکە کەوتـووەو دوای بردنـی بۆ نەخۆشـخانە پزیشـکەکان بە خانـەوادەی گەنجەکەیان ڕاگەیاندووە کە کوڕەکەیان تووشی جەڵتەی خوێـن بـووەو ڕەنگە گەڕانەوەی ئاسـتەم بێـتو پێدەچێـت بـۆ دواجـار ماڵاوایی بکات. سـەرەنجام بەڕەزامەندی خانەوادەی (دانیال) ئەندامەکانی جەستەی (دانیال) لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا بە هەشت نەخۆش بەخشرا.

دایکـی (دانیـال چاروسـایی) دەڵێت: (دانیال) بەڕۆژوو بوو، دوای بانگی ئێوارە بـە خواردنێکی کەم ڕۆژووەکەی شـکاند، پاشـان ڕۆیشـت بە دوای باوکیـدا. باوکی (دانیال) ئەو شـەوە لە سـەر کاربوو، من هەرچـی بە (دانیـال)م گوت کـە باوکت بە پاسـی تایبەتی فەرمانگە دەگەڕێتەوە، مـەڕۆ بەدوایدا، بـەڵام (دانیـال) قبوڵی نەکردو بە خۆیو ماتۆڕەکەیەوە ڕۆیشـت بە دوای باوکیدا. ئەو شەوە دڵەڕاوکێیەکی زۆر توندم هەبوو.

چەنـد کاتێکـی کـەم دوای دەرچوونـی (دانیال)، لە نزیك ماڵەکەمان گوێبیستی دەنگی ئامبولانس بووم، دڵەڕاوکێکەم زۆر زیاد بوو.

کاتێك (دانیال) لە ماڵ دەرچوو لەگەڵ ئۆتۆمبێلێکی ڕەنگی سـپی پێکیاندا دابوو، بە توندی سەری بە شۆستەی شەقامەکەدا درابوو. من بێئاگابووم لەم هەواڵە، کاتێك باوکی لەسـەر کار گەڕایەوە ماڵەوە گوتی: دراوسێکان دەڵێن، ئۆتۆمبێلێکی ڕەنگ سپی لە (دانیال)ی داوەو قاچی شکاندووە. ئێمە بە خێرایی بەرەو نەخۆشـخانە ڕۆیشتین، بـەڵام کاتێـك گەیشـتینە نەخۆشـخانە تێگەیشـتم کە ڕووداوەکە لە وە خراپترە کە پێمان گەیشتبوو.

کوڕەکەمان گواسـترابووەوە بۆ بەشی (ICU) لەگـەڵ ئەوەشـدا هێـدی هێدی خانەوادەکەمـان دەهاتن بۆ نەخۆشـخانە. هاوسەرەکەشـم بـە هەبوونی نەخۆشـی شـەکرەوە بـاری تەندروسـتی جێگیـر نەبوو، هەر بۆیـەش ڕەوانەی ماڵەوە کرا. پزیشـکەکان پێیان ڕاگەیانـدم کە ڕەنگە (دانیال) چاك نەبێتەوە، گەڕانەوەی بۆ ژیان ئاستەمە، ئایا ڕەزامەندن لەسەر ئەوەی کە بەشەکانی جەستەی ببەخشرێت؟

باوکـی (دانیـال) لە سـەرەتادا ڕازی نەبـوو، دەیگـوت پێویسـتە ئومێدمـان هەبێت، هەر بۆیەش (دانیال) گواسترایەوە بۆ نەخۆشخانەی گولسـتان ئەهواز، بەڵام لەوێـش دکتـۆرەکان گوتیـان کوڕەکەتان تووشی جەڵتەی مێشك بووە.

(دانیال) تاکە کوڕی من بوو، هەمیشەو لـە هەموو شـتێکدا باشـترینم بـۆ ئەو دەخواسـت. لە یادمـە ماوەیـەك بەر لە ئێسـتا (دانیال) پێی دەگووتم: (دایکە گەر ڕۆژێك من مردم، جلی ڕەشم بۆ مەپۆشە)، ئـەو ڕۆژە لە نەخۆشـخانە تەنها بیرم لە قسەکانی دەکردەوە، لە خوا دەپاڕامەوە کە هەرچی چاکەیە بۆ ئەو بێنێتە پێشـمان. ڕەزامەنـدی بـە بەخشـینی بەشـەکانی جەسـتەی کوڕە تاقانەکەم زۆر سەختبوو، بـەڵام لەو سـاتەدا بیـری ئـەو دایکانەم دەکـردەوە کـە منداڵەکانیان نەخۆشـنو نایانەوێت وەکو من جەرگ سوتاو بن.

(دانیال) ئەمانەتی خوا بوو لای ئێمە، ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان لەبەرخاتری خوداو پاشـان دڵخۆشکردنی ئەو کەسانەی کە لە مێـژە چاوەڕوانن کەسـێك ئەندامێکیان پێببەخشـێتو لـە نارەحەتـیو ناسـۆر ڕزگاریـان بێت، لەبەرئـەوە ڕەزامەندیم نوانـد لەسـەر بەخشـینی بەشـەکانی جەستەی جگەرگۆشـەکەم. دوای ئەوەش تەنهـا سـورەتی "والعصـر"م خوێندەوە، فرمێسـکی چاوەکانـم جۆگەلەیـان بەستبوو.

دایکی (دانیـال) دەڵێت: من هەروەکو دایکەکانی تر هیوایەکی گەورەم هەبوو بۆ کوڕەتاقانەکـەم، بە نیازبـووم لە تەمەنی هەژدە سـاڵیدا هاوسـەری بۆ دیاری بکەم. بـەڵام ئەو کە لە هەقدە سـاڵیدا بە تەنیا بەجێی هێشـتمو لەگەڵ ڕۆیشتنەکەشیدا ژیانی چەند نەخۆشێکی ڕزگارکرد.

ئێسـتا لە ناخەوە دڵـم ئارامە، بەڵام لە لایەکی دیکەوە دڵم بۆ (دانیال)ی کوڕم تەنگە. بەڵام ئاراممو ئیتر فرمێسك نارێژم. چونکە کوڕەکەم لە پاش مردنی بووە هۆی بەختەوەرکردنی هەشـت نەخۆش، کە لە خەونیشیاندا نەبوو ڕۆژێك لە ڕۆژان چاك ببنەوە.

سەرچاوە: روزهای زندگی




# ئەدەبی کوردی ٣

## لەخزمەتی (نالی)دا

گریانی منو خەندەی تۆ ئێستە دەشوبهێ
بەو مەوسیمی بارانە کەوا خونچە دەپشکوت

ئەوەی شیعری نالی نەخوێندبێتەوە، هەرگیز تامی شیعرو ئەدەبو وشەی جوانی نەکردووە، ئەوەی ئاشنا بەو قەصیدانەی نالی نەبێت، کە دەبوا ئێمەی کورد وەکو (معلقات) بە گەردنی منارەی مزگەوتەکانو بە تەوێڵی خوێندنگاو زانکۆکاندا بە ڕێزەوە هەڵمان واسیبان، ئەوا مەحرومە لە گوڵزاری پڕ گوڵو گوڵزاری شیعری کوردیو گوڵاوی وشەو پەیڤی شیرینتر لە هەنگوین!!

دیوانی نالی دەبێت لە کتێبخانەی هەموو خوێندەوارو ڕۆشنبیرێکدا هەبێتو ڕۆژانە پێویستە بۆ ڕەوینەوەی خەمی دڵ بۆ پشووی ڕۆحو ساتێك حەوانەوە لەم جیهانە جەنجاڵو پڕ لە ژاوەژاوەدا، وەکو کلدان چاوەکانمانی پێبڕێژین!

وەکو هێمنی شاعیر دەڵێت: هەموو کورد قەرزاری مامۆستا مەلا کەریمی مودەریسو کوڕەکانین، کە گەورەترین خزمەتیان بە دیوانی نالی کردووە، لە ڕێگەی ڕاڤەو لێکدانەوەی شیعرەکانی، کە هەموو خوێندەوارێك دەتوانێت بە یارمەتی ئەو خزمەتە گەورەیە، لە شیعری نالی حاڵی ببێت!

بەندە تەنها چەند دێڕێك لە شیعری جوانی ئەو شاعیرە بەرزە بە گوێی ئەدەب دۆستاندا دەداتو دەتوانن بە خوێندنەوەی لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەکەی مامۆستای مودەریس ئاوێتەی مانای جوانی ئەو شیعرانە بن!

لە دڵدا ئاتەشی عیشقت بڵێسەی میثلی تەننورە
شەتی ئەشکم نەبێ مانیع، دەسووتێم، دەبمە کۆی نوورە
بە ناری عیشقو ئاوی دڵ، جەستەت وەك حەزرەتی موسا
تەریقی بەحری فیرعەونو ڕەفیقی ئاتەشی توورە

سەبارەت بە هۆکاری زەردی گوارەو تەرزەی سەرسوڕهێنەری گەرمی چاوەکانیشی دەڵێت:

سەراپای گوارە زەردی ترسو لەرزە
دەڵێی عاسی بووە لەو جێگە بەرزە!
سوروشکم ئابو دانەی نارە، کێ دی:
بەگەرمی داوەڕێ بەم تەرزە تەرزە؟!

تەماشا لە وەسفی شەوی هیجراندا چ دەڵێت:

شەوی یەڵدایە، یا دەیجورە، ئەمشەو
کە دیدەم دوور لە تۆ بێ نوورە ئەمشەو؟

دڵم وەك حاکمی مەعزولە قوربان
خەڵاتی وەسڵی تۆی مەنزوورە ئەمشەو
دڵیش مایل بە دیدەی تۆیە، بۆیە
لە من وەحشیو ڕەمیدەو دوورە ئەمشەو

یاخود چ تەعبیرێکی بەرزە کە دەڵێت:

چاوو دڵ شەڕیانە، نازانم خەتای کامیانە خۆ
تا بەداری کەم، دەریکەم، بیخەمە شینو چەمەر
نوری چاوم! چاوەکەم بێ نوورە بێ تۆ، زڕەڕەێی
خاکی دەرگاکەت ببێژم بیکەمە کوحلی بەسەر

یاخود کاتێك دەڵێت:

شکافێکە کلافەی نافی زوڵفت
دەڕێژێ میسکو عەنبەر لێرە تاچین
لەسەر بەرگی گوڵێکی باغی حوسنت
هەزار، گوڵچینی بێبەرگو نەواچین
ئەتۆ میهریو مەهرڕوویان ستارەن
لە خزمەت شەوقی تۆدا شەو چراچین؟!

ئەی دەبێت شیعر دۆستان چی بڵێن، بەرامبەر بەم شاکارە بەرزەی نالی؟

وەرە ساقی، بەشینو نەدبو واوەی
ئەوا فەرشی حەیاتی خۆم دەکەم تەی
دەزانی خۆ دەچینە جێی غەریبان
بە مەرگی خۆت، ئەگەر چاوان سیاکەی*
گلەناکەم ئەوەندەی دەنکە جۆیێ
ئەگەر کەڵلەی سەریشم پڕ لە کاکەی
هەموو وەقتم دوعایە، داخۆ کەی بێ
بە تیرێکم شەهیدی کەربەلاکەی

تا لە کۆتاییدا دەڵێت:

گوتت نالی، ئەتۆ بمرە ئەمن دێم
خودا کەی بێ، خودا کەی بێ، خوداکەی؟!

هەرشادبن

- ئەگەر مەبەستی سوێند خواردن بێت بە مەرگی یار، ئەوا سوێندخواردن بە غەیری خودا دروست نییە، بەڵام وادەردەکەوێت، کە مەبەستی ئەوەیە کە تووەمەرگی خۆت وەکو پاڕانەوەیەك داوا دەکات کە ئیتر چاوی نەڕێژێو بەمکارە تۆزێك خەم دەربڕێ بۆ مردنی ئەم.